# وەرزنامەی «نامەی ئەدەب»

دەستەی نووسەران:
١- مستەفا ئیلخانیزادە
٢- سەید یاسین قورەیشی
٣- حوسێن شێربەگی
٤- ئەمین گەردیگلانی
٥- لەیلا ساڵحی
ویراستار: ڕزگار نووری
کاری ڕووبەرگ: کۆمار ڕەزایی
پیتچن: ڕزگار نووری
چاپ : چاپ و تەکسیری حیسامی تەلەفوون ٦٢٢٠٧٦٠

به ناوی خوای زانا و توانا

**له جیاتی سه ر وتار**

فەرهەنگ و ئەدەبی هەر گەلێک پێویستی بە خزمەت کردن و هەوڵ و تێکۆشانی هەمەلایەنەیە، بە تایبەت چینی رۆشنبیر و قەڵەمبەدەستی ئەو گەلە ئەرکێکی زیاتر و گرینگتریان لەوبارەوە لە ئەستۆیە. هەر لەبەر ئەوە کە هەوڵ و تێکۆشانی بە گەل و هاوکاری و هاوبیریی دەستە و تاقمێک هەمیشە لە هەوڵ و تێکۆشانی تاکەکەسی سەرکەوتووتر بووە ئێمە بە هەست پێکردنی ئەم زەروورەتە چەن ساڵ لەوەپێش کۆڕی فێرکاری و فەرهەنگیی ئەدەبیمان بە هاوکاری دەستەیەک لە نووسەران، شاعیران، ئەدیبان و هونەرمەندان لە شاری بۆکان دامەزراند.

بە شایەدیی خەڵکی شاری بۆکان و زۆربەی شارەکانی دیکەی وڵاتەکەمان، کۆڕی فێرکاری و فەرهەنگیی ئەدەب بە ئیمکاناتی زۆر کەم توانیویەتی دەورێکی بەرچاوی لە بواری کاروباری فێرکاری و ئەدەبیی لە کوردستانی ئێران هەبێ.

بەشی فێرکاریی ئەم کۆڕە توانیویەتی لە ماوەی ئەم شەش، حەوت ساڵەدا زیاتر لە حەوتهەزار کەس لە شاری بۆکان و گوندەکانی دەوروبەری ئەم شارە و ئاواییەکانی سەر بە شارەکانی، سەقز، دیواندەرە، زەرینە، شاهیندێژ، میاندواو، شەهریاری کەرەج، زاغمەرزی مازندەران؛ فێری خوێندن و نووسین و ئەدەب و زمانەوانی کوردیی لە چەند قۆناغی جۆراوجۆر بکا و دوو خولیش لە زانکۆکانی قەزوین و بووعەلی هەمەدان بە هاوکاری ئەنجومەنە ئەدەبییەکانی ئەو زانکۆیانە و مامۆستایەتی مامۆستای پایەبەرز و دڵسۆز خوداڵێخۆشبوو مامۆستا حەسەنسەلاح سۆران و کاک سولەیمان عەبدوڵڵازادە دابنێ، کە لەو خولانەدا ژمارەیەکی بەرچاو فێری خوێندن و نووسین و ئەدەبی کوردی بکا. هەر ئێستاش لەسەر ئەمکارە بەردەوامە و بۆ ئەوکەسانەی بە رۆژ ناتوانن لە شوێنی ئەم ناوەندە لە ژێرزەمینی پاساژی شارەداری بەشداری بکەن، خولی شەوانەی لە ئامووزشگای «خەیام» و «نەوا» داناوە و خاوەنی ئەم ئامووزشگایانە بە خۆرایی شوێنیان بۆ وتنەوەی وانەی کوردی پێداوین.

بەشی ئەدەبیی ئەم ناوەندەش جگە لەوەی لە ماوەی ئەم شەش، حەوت ساڵەدا، هەموو پاشنیوەڕۆیانی رۆژانی چوارشەممە کۆڕە ئەدەبییەکانی خۆی بەڕێوە بردووە، تا ئێستا چەند کۆڕ و ئاهەنگی گەورەی ساز کردووە وەک کۆڕی شیکردنەوە و لێدوان لەسەر کتێب و نووسراوەکانی مامۆستا حوسێن شێربەگی، خانمی سروەی شەریفزادە، شلێر مەجیدپوور، کۆڕی پێگەی رەخنە لە ئەدەبی کوردی بە کارگێری مامۆستایان عەبدولخالق یەعقووبی و

حەمەساڵح سووزەنی، کۆڕی ڕێزلێنان لە مامۆستایان هێدی، ڕاوچی، ئەفخەمی، قالەمەڕە و چەند کۆنفڕانسی زانستی وەک کۆنفڕانس بۆ دوکتور ڕەشید کرمانج لەسەر زمانەوانی کوردی، کۆنفڕانس بۆ دوکتور ئەجمەددین جەبباری بەرپرسی پەژووهیشکەدەی زمان و ئەدەبی کوردی لەبارەی ئەدەبی کوردی و کار و ئەرکی پەژووهیشکەدەی زمان و ئەدەبی کوردستان. کۆنفڕانس بۆ دوکتور شەهباز موحسینی مامۆستای زمان و ئەدەبی فارسی لە زانکۆی ئازادی مەهاباد لەبارەی لێکۆڵینەوە و نووسینی وتاری زانستی و چەند ڕێوڕەسمی کۆتایی خولەکانی فێرکاریی کوردی لە شارەکانی بۆکان، زانکۆی بووعەلی هەمەدان و گوندەکانی ڕەحیم‌خان، سەرا، تورجان، گامێشگولی، ئاچیت و چەند ئاوایی دیکە ساز بکا.
هەروەها چەند ئۆردووی بە بەشداری مامۆستایان، خوێندکاران، ئەندامان و هونەرمەندان بۆ کونە کۆتری سەهۆڵانی مەهاباد و سەردانی گلکۆی مامۆستا هەژار و هێمن لە مەهاباد، ئاوهەڵدێری شەڵماشی سەردەشت، گۆلی زرێواری مەریوان، هەورامانی تەخت، پاوە و نۆتشە و ئاوهەڵدێری بل، تاق بوستان و ئیسلاماوا و کەرەند و ڕێژاو و چوونە سەر مەزاری گەورە پیاوانی ئەهلی هەق(کاکەیی) ئەنجام داوە، و لە هەموو ئەم شوێنانە ڕێورەسم و کۆڕی شیعری ساز کردووە کە هاوڕێ بووە لەگەڵ ئەوای خۆشی شمشاڵی قالەمەڕە و نایەی عوسمانەسوور و گیتاری زانا عومەرعەبدوڵلاهی.
لە ساڵی ١٣٨٧ خولێکی (آموزش ادبیات کودکان و نوجوانان) واتا فێرکاریی ئەدەبی منداڵان و مێرمناڵان بۆ ماوەی دوو مانگ، بە هاوکاری (انجمن نویسندگان کودک و نوجوان ایران) و بە یارمەتی ماڵیی بەڕێز دوکتور پەرویز جێگری وەزیری فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی ئێران، سەرکەوتووانە بەڕێوە بردووە کە لەم خولەدا چەند کەس لە مامۆستایانی ئاموزش و پەروەرش و نووسەران و خوێندکارانی بۆکان بەشداریان کردووە، مامۆستای ئەو خولە خانمی لەیلا ساڵحی کە خۆیان شاعیر و مامۆستای دواناوەندین و خاوەنی بڕوانامەی کارشناسی ئەرشەد(ماجستێر)ە زۆر شارەزایانە و دڵسۆزانە ئەم خولەیان بەڕێوە بردووە فێرخوازان سوودیان لێوەرگرتووە. هەروەها خولێکی دیکەش لە ساڵی ١٣٨٨ بە بەشداری ٣٢ کەس سەرکەوتووانە بەڕێوە چووە ٢٦ کەس لە بەشداران کە لە تاقیکاری سەرکەوتوون بڕوانامەیان لە لایەن (انجمن نویسندگان کودک و نوجوانان ایران) پێدراوە و ئێستا خولی تەکمیلی (سەرتر)ی ئەدەبیاتی کوودەکان و ئەوجەوانان بە بەشداری ٣٦ کەس کە زۆربەیان لە مامۆستایانی ئامووزش و پەروەرش و خوێندکارانی زانکۆ و نووسەران و شاعیرانن بە مامۆستایەتی خانم لەیلا ساڵحی و کاک مستەفا ئێلخانی‌زادە بەڕێوە دەچێ. بۆ ئەم دوو خولەش هەر بەڕێز

دوکتور پەرویز جێگری وەزیری فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی یارمەتی پێویستی داوین و ئەم خولانە بەخورایی بووە.
کردنەوەی ویبلاگێکیش بە ناوی دەنگی ئەدەب (www.dengiedeb.blogfa.com)
چاپی ئەم وەرزنامەیەش(وەرزنامەی نامەی ئەدەب) بەشێکە لە کارەکانی ئەم کۆڕە بۆ خزمەتی زیاتر بە فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی. جێی ئاماژەیە ئەم هەموو هەوڵ و تێکۆشانە بە هاوکاری و زەحمەتی هەموو ئەندامان و مامۆستایانی پێشوو و ئێستای ئەم ناوەندە بووە. بە تایبەت زەحمەت و هەوڵ و تێکۆشانی دوو کەس لە ئەندامانی بەشی ئیداری ئەم ناوەندەیانی: کاک رزگار نووری و پای ئامینە فەتاحی کە بەشداری زۆر چالاکانەیان بووە لە تەواوی بەشەکانی ئیداری و تەشریفاتی کۆڕی فێرکاری و فەرهەنگی ئەدەب لەم چەند ساڵانەی رابردوودا.

**مستەفا ئیلخانیزادە**

وتارێک لە: «ئەحمەد حەقناس»

## دیالۆگی لەیەک حاڵیبوون

«سەفەر»

ئازادی سەرەتا
ئاوازی وڵاتی مردن فێر بووە
هەور
دەنگی گرمە
منیش بە دوای کۆتایی ئەم سەفەرەدا
ڕۆحم لە لەپی دەسم خستووە

بڵێی بە ڕاستی ساتی ئەوە نەهاتبێ کە پەنجیرە لە دەنگێ بکەینەوە تا ئێستا ئاشنایەتییەکی بە تەواو مانای لە ئێزگەی بیستنی گوێمان نەبووە؟ بهێڵین کە ئەو شتەی جیا لە فەرهەنگی ئێمەیە ڕووبەڕوومان دابنیشێ و بنەمای پرۆژەی یەکبوونێکی لێحاڵیبوون دابڕێژین؟ بڵێی ئەو شتەی کە لەگەڵ بیروبۆچوونی ئێمە ناگونجێ تێگەیشتنی هەبێ؟ ئایا بە ڕاستییەکی ڕاست ساتی ئەوە نەهاتووە بیر و خەیاڵەکان لای یەک دابنێین و ئاوانی نەزانی بخەینە ژێر پرسیارەوە، بڵێین خۆزگە ئەو ڕۆژە دەهات و بە ئازادی نووسین بە توندڕەو ناودێر نەدەکرا؟ ساتی ئەوە هاتووە کە قەبووڵی کەین لەسەر خاڵە ڕەشەکانی بیاکی بیروباوەڕی خۆمان دیالۆگی دیموکراسیمان هەبێ تا ئاواتی خەیاڵەکان لە چوارچێوەی ژوورێکدا بە قوفڵ کراوی نەمێنێتەوە؟ بە ئامەزرۆییەوە بڵێین ساتی ئەوە نەهاتووە وا بیرکەینەوە ئێتر لەیەک حاڵیبوونی وشەکان گوناح نییە؟ کاتێ دەنگی ئەدەبی زمانی نەتەوە سەرکەوتووەکان لە ڕێی دیالۆگی یەکبوونەوە خەریکی مۆدێرنیزمی دیموکراسین، ئێمە ناتوانین و نابێ بە ڕەتکردنەوەی بیروبۆچوونی ئەم دەنگانە بە بەهانەی لێحاڵی نەبوونێکی ساکار لە جێی هەقی هەڵبژاردن لەگەڵ بیروبۆچوونی خۆمان هەموو ڕێیەک لەسەر دیالۆگی بە جیهانی بوونمان بگرین. ئێمە دەتوانین لاپەڕەی کتێبی بیروباوەڕی خۆمان هەڵدەینەوە. بێترس لە بەردی ئەو وتانەی کە بۆ لێڵ بوون دەیخەنە کانیاوی نووسینمانەوە. کەوی قسەکانمان لە قەفەسی هەست بە ئازاد بوونێکی بنەڕەتی نوێخوازی بسپێرین. بەڵام بێ دوودڵی لە ئاڵوگۆڕی ئەم دیالۆگانە ئەوە ئەو کەسە سەرکەوتووە کە جێی ترسی نەزانینی هەتاهەتایی بە ئاوێتە بوونی زانستەکانی کە لە هاوقسەی ڕووبەڕووی دەبیستێ بیگۆڕێتەوە. وا پێدەچێ بە جۆرێ لە وشەی لەیەک گەیشتن ناو بنێین. ئەو نوێخوازییەش کە لە دەروون و کار و کرداری خۆمانەوە سەرهەڵدەدا دەبێ ئێزن بدەین کە ئەوانیش نەزانییەکانی خۆیان بەو حاڵیبوونەی کە لەسەر زانستی ئێمە هەیانە پەروەردە بکەن. تا بە متمانەیەکی پڕ لە هیواوە دەرگای دیالۆگی لە یەک حاڵیبوونێکی هەمیشەیی بۆ دوارۆژ بکەینەوە.

## کورتە باسێک لە ژیاننامەی (ک.د.ئازاد)

کەریمی دافیعی شاعیرێکی پڕکار و ماندوونەناسە لە ناو شاعیرانی کورددا ناوێکی بەرچاو و ناسراوە. ئێمە لەم ژمارەیەدا هەوڵمان داوە بۆ باشتر ناساندنی کاک کەریم کورتەیەک لە ژیاننامەی چاپ بکەین و چەند شیعرێکی بێنینەوە ئەمەش ژیاننامە و شیعرەکانی کاک کەریم:

- ناوی (کەریم دافیعی)یە!

- ساڵی ۱۳۳۹ لە ناوچەی سەردەشت لە دایک بووە.

- خوێندنی سەرەتایی لە سەردەشت و خوێندنی(ڕاهنومایی) لە بانە تەواو کردووە.

- بۆ خوێندنی ناوەندی(دبیرستان) چوار ساڵ لە شاری میاندواو خوێندوویەتی. دیپلۆمی هەر لە میاندواو لە ساڵەکانی ۱۳۵٦-۱۳۵۷ وەرگرتووە.

- کارناسی ڕاوێژکاری(لیسانس مشاورە)ی لە زانستگای تەورێز وەرگرتووە و بڕوانامەی لیسانسی خۆی لەسەر (کوردی سۆران) نووسیوە بە ناوی: (ناساندنی تایبەتمەندییەکانی فەرهەنگی کوردانی سۆران) کە ئەو ساڵە یەکێک لە باشترین بڕوانامەکان بووە و پلەی یەکەمی دراوەتێ.

- ساڵی ۱۳۵٤ بۆتە هۆگری شیعر و ئەدەب و هەر لەوساوە شیعری وتووە.

- ساڵی ۱۳٦٤ هەوەڵ شیعری لە گۆڤاری «سروە»دا بڵاو بۆتەوە. پاشان لە زۆربەی کتێب و گۆڤارە فارسی و کوردیەکاندا لە ناو ئێران و ئورووپا و گۆڤارەکانی کوردی لە دونیادا شیعری چاپ کراوە و جێگەی ئاماژەیە تا ئێستا پتر لە ۵۰۰ بەرهەمی(شیعر و چیرۆک و بەرهەمی دەروونناسی و بابەتەکانی ئەدەبی) لە گۆڤار و کتێبەکانی ئێران و جیهاندا چاپ کراوە!

- ۲۷ بەرهەمی (بە شێوەی کتێب) هەیە کە بێجگە لە یەکێکیان کە بە ناوی «چبکەم تا تۆ قەت بەهارت لێ نەتۆرێ» لە سوئێد چاپ بووە و ۲٦ بەرهەمی تری، بە هۆی گیروگرفت و بێدەسەڵاتی بڵاو نەبوونەتەوە!

- بەرهەمی زیاتر لە ۳۰ ساڵ نووسینی ئەدەبی کە زۆربەیان شیعرن و ئامادەی چاپن بریتین لە:

۱- چبکەم تا تۆ قەت بەهارت لێ نەتۆرێ

۲- نیشتمانی تازەی شیعرم

۳- وەرزی فێنکی بێ‌وادە

٤- شەیدایی

٥- یاخی

٦- شەوگار نامێنێ تاکوو سەر

٧- پایزە خەم

٨- غەریبانە

٩- لێرە دڵداری تاوانە!

١٠- بۆ خەمێکی بێ کۆتایی

١١- یاسای هەرمان

١٢- کوا یەک ڕەنگی دەورانی زووی؟

١٣- من هۆگری ئەم کوێستانەم

١٤- خۆشەویستێکم هەبوو

١٥- وەرزی بەرزی خۆشەویستی

١٦- قەڵەمێکی فرەوێژ و فرهاوێژ

١٧- یاد و یادگار، بۆنە و بەهانە

١٨- تا ئاربابای خۆشەویستی

١٩- سەردێڕی خوێن

٢٠- تا ئەوپەڕی فەرامۆشی

٢١- کووچە ڕازەکانی لاوەتی

٢٢- بیشکەکانمان پێناکەنن!

٢٣- ئاوانەکانمان هەڵنافڕن

٢٤- دوایین وێستگە!

٢٥- ئاوێتەکانی دەروون(کورتە چیرۆک)

٢٦- کوردانی سۆران(لێکۆڵینەوە سەبارەت بە زمان و فەرهەنگی کوردی سۆران)

٢٧- خەونووچکەکانی بێداری! (کورتە چیرۆک)

- ساڵی ١٣٦٨ وەک دامەزرێنەری ئەنجوومەنی ئەدەبی لە شاری بانە تێکۆشانی خۆی درێژە پێداوە. بێجگە لە دامەزراندن وەک بەڕێوەبەری ئەنجوومەن کاری کردووە و زیاتر لە پێنج ساڵ بەڕێوەبەری ئەم ئەنجوومەنە بووە.

- ٢٥ ساڵە مامۆستای قوتابخانەیە!

- ئێستا بێجگە لە کاری ئەدەبی، لە دەبیرستانەکانی شاری بانە و لە «مرکز مشاورە خانوادە»دا وەک ڕاوێژکار خەریکی کارە!

***

**دڵنیایی**

بیر لە هەرچی دەکەمەوە،

دەکەومە ناو شک و گومان.

زۆر دەترسم لە داهاتوو

زۆر دوو دڵم،

لە ئاکاری دونیای ئەمڕۆ!

بەڵام لە دوو شت دڵنیام،

وەفای خۆم و

ئەوینی تۆ!

***

**خۆر**

پەردەیەکی سوور،

وەلاچوو!

پەنجەرەیەک ئاوەڵا بوو!

خۆری سروشت دای لە ناو ماڵ

خۆری ناو ماڵ،

دای لە شەقام!

من بەرانبەر پەنجەرەکە،

ڕاوەستاوم!

لە نێوانی ئەو دوو خۆرە،

قەتیس ماوم!

خۆرێک جەستەم ئەلاوێنێ!

خۆرێک،

ڕووحم ئەوتاوێنێ!

***

**پەنجەرە**

ئەو پەنجەرەی

وەک حەنجەرەی،

شیعرەکانم ئاوەڵا بوو،
ئەو پەنجەرەی
هەزار ورەی
سەوز و سووری لە ناوا بوو،
ئەم ڕۆژانە بێ دەربەستی
دەستی ساردی خەزان بەستی!
بڵێی تاکوو بەهار دادێ و
دەستی هەتاو دەیکاتەوە
ئازداری ئەو دیو پەنجەرە
«ئازاد» لە بیر نەباتەوە؟!

ئامادەکردنی: جەعفەر هەمزە قورمیش
سەرچاوەکان: ئالوگۆری زەین بە سرنج دان بە لەش.
نووسەر: جون بورسێکو
وەرگێر: میهدی قەراچەداغی

## «ئالوگۆری زەین»

ئەگەر بە وردی بڕوانییە دونیای ئەمڕۆ بە هۆی پێشکەوتنی تەکنیک و زانست گۆرانکارییەکی زۆر خولقاوە، بە شێوەیەک سرنجی هەر مرۆڤێکی بۆلای خۆی ڕاکێشاوە، ئەوەی ڕاستی بێ ئەو گۆڕانکارییانە ئەگەرچی بارودۆخی گوزەرانیان هاسانترکردووە بەڵام برێ جار تەنگژەی دەروونی بە دواوە هەیە. بە قەولی زانایەک بە هۆی عیلم و زانست سروشتی وەحشمان دەستەمۆ کرد بەڵام برێ جار وا باشترە بە تێڕوانینێکی وشیارانەوە ئاوڕێک لە خۆشمان بدەینەوە تا بە سەر ترس و خەفەت و ناهومێدیدا زاڵ بین و خۆشی و شادی و گەشە نیشتەجێ بکەین. دەبێ ئەوەش بزانین هەموو کات بەرگری چاکترە لە دەرمان چونکە بەرگری پلەی ساخی و تەندروستی بەرز دەکاتەوە و ناهێڵێ نەخۆش کەوین، بەڵام خودای نەکردە ئەگەر تووشی نەخۆشی بووین لە خولی یەکەمدا دۆزینەوەی هۆی نەخۆشی ئەستەمە، لە دوایشدا چارەسەری وەخت گر و پڕخەرجە.

وەکوو پسپۆران باس دەکەن ڕادەیەک لە نەخۆشییە جەستەییەکان بە هۆی بارودۆخی دەروونییەوە پێکدێن کە بە زمانی عیلمی شێوە جەستەیی یا Soma to form یان پێدەڵێن. وا باشە لە پێناو پتەو کردنی بارودۆخی ڕووحی دەروونی خۆمان کار بکەین تاکوو بتوانین سەرخۆش و سەری حاڵ بین و پێشی نەخۆشییە جەستەییەکان بگرین.

یەکێک لەو بوارانەی دەبێ ببینوین گۆڕینی بیر و زەینە، کە دەتوانێ ناڕاستەوخۆ لەسەر ساخی و سلامەتی لەش شوێن دانێ. پێمخۆشە ئاماژە بەو ڕاستەقینەیە بکەم ئالوگۆری زەین بۆ لەبەرچاو گرتنی تەندروستی و بەرژەوەندییەکانی خۆمانە نەوەک ئەوەی بە تەواوی تەڵقینهەڵگر بین و نەتوانین لەباری فکرییەوە لەسەر پێی خۆمان ڕاوەستین. بەو پێودانە چەند خاڵێک هەیە ئاماژەیان پێدەکەین تا بتوانێ بۆ ناساخی جەستەیی و دەروونی یارمەتیمان بدا...

1. دیارە ئێمە ناتوانین پێش بە هەموو ڕووداوەکان بگرین یا بە چۆکیان داببنین بەڵام دەتوانین بە ڕوانگەیەکی ڕاستەقینەوە بیروباوەڕی خۆمان لەگەڵ ڕووداوە جۆراوجۆرەکان پتەوتر کەین.

بۆ بەرەبەرەکانی لەگەڵ ڕووداوە جیاوازەکان چەند لایەنێک هەیە دەبێ لەبەر چاوی گرین:

ئەلف) بەجێی ئەوەی وەکوو مەترسیەک بڕوانینە ڕووداوەکان وەکوو تاقیکاریەک چاویان لێکەین کە دەتوانن ئێمە ڕابێنن بۆ خۆڕاگری و بەربەرەکانی تا چارەیەک بدۆزینەوە.

ب) باشە بزانین ورەی دەروونی هەموو کات هاوڕێمانە ئەو باوەڕە دەتوانێ وەزیەک بێ بۆ خۆڕاگری و پێک هێنانی هێمنایەتیی دەروونی.

ج) لە کاتی تووشبوونی تەنگژە هەوڵ بدەن بە جوانی و لەسەرەخۆ هەناسە هەڵکێشن. بۆ چی؟ چونکە هەناسە ئەگەر بە جوانی وەکاری بێنین یەکێک لەو ئەرکانەی کە بە ئەستۆی هەناسە کێشانەوە هەیە ئەوەیە ئۆکسیژێن کە خۆراکی بنەڕەتی و حەیاتی مێشکە بە مێشکمان دەگەیەنێ، مادەی پێویستی دیکەی مێشک قەند یا شەکرە لە ڕێگەی خواردەمەنییەوە دابین دەکرێ. جا کەوایە ئەگەر مێشک بە جوانی کار بکا و دابین کرێ لەسەر زەین و بیرۆکەی جوان و گەشەداریش لەسەر زەینی وشیارگەر شوێن دادەنێ.

- چەند کارێک بکەن: هەرکات تووشی گرفت و هاڵۆزی بوون هەوڵ بدەن ئارام هەناسە بکێشین ئەگەر ٥ چرکە هەناسەتان کێشا ١٠ چرکە ڕایگرن تا دەرفەت پێکبێ ئۆکسیژێن بە مێشک بگا لە ماوەی ٥ چرکەشدا دەریدەنەوە دەرێ.
- هاوکات لەگەڵ هەناسە هەڵکێشان و ڕاگرتنی هەناسە تەلقینی بیرۆکە و وتەی باش و بەکەڵک بە خوتان بکەن بڵێن: من شادم، من لەسەر خۆم، من بە هێزم...

تا هاوکات لەگەڵ گەیاندنی پێخۆری مێشک، پێخۆری زەینیش لە ناو دەمارەکانتدا جێ بگرێ شک مەکەن تاقیکاریەکان سەلماندوویانە شوێنەواری ئەوتۆی لەسەر ئاڵوگۆڕیی زەیندا هەیە.

٢) لەشساخی بریتیە لە سلامەتی جەستەیی و زەینی کە وایە باشترە لانی کەم حەوتووی سێ ڕۆژ، ڕۆژی ٢٠ دەقیقە وەرزیش بکەن.

- لە کاتی خواردندا بە ئاگادارییەوە بزانین چ دەخۆین و چۆنی دەخۆین. باشترە وا بخۆین کە تامی پاروو بچێژین و بە وردی بیجووین ئەو کارە هەم یارمەتی گەدە دەدا و دەیحەسێنێتەوە هەم یارمەتی زەینمان دەدا و وشیارمان ڕادەگرێ.
- هەوڵ بدەن بە سەر فکر و زەینی خۆتاندا زاڵ بن ئەم شێوەیە وشیارتان ڕادەگرێ و خۆڕاگرتان دەکا.
- هەوڵ بدەن چایی و کافێین کەمتر بخۆنەوە.
- تێکۆشن سەوزی و میوە و گۆشتی ماسی پتر بخۆن.
- هەموو ڕۆژێ لە شوێنێکی باش تاوێک بحەسێنەوە... و بە تەلقین کردنی وتەی باش و دۆعا کردن دەروونتان هێوەر بکەنەوە هەتا مێشکتان بحەسێتەوە و زەینتان باشتر کار بکا.

٣) وا باشترە هەموو کات خۆتان بە هێز بێتە بەرچاو، چونکە تەلقینی جوان شوێنەواری باشی لێدەکەوێتەوە... Jimy Huege پالەوانی پێشووی ئولەمپیک بە هۆی نەخۆشی دەمار و لەش هێوای پالەوانەتی لە دەست دا. دەستی کرد بە ڕاهێنانی لەش وا بە سەر نەخۆشیدا زاڵ بوو کە توانی بۆ جارێکی‌تر مێدانی پالەوانەتی وەربگرێتەوە... ئەمە نیشان دەدا ئەگەر بیرۆکەی باش لە ناو مێشکدا جێگر کەین دەتوانین زۆربەی گیروگرفتەکان بە ئاسانی حەل و فەسل کەین و لە ناویان بەرین.

٤) هەلومەرجەکان دەگۆڕدرێن. ئالوگۆڕ تایبەتمەندێکی ڕاستەقینەیەیە. پێی ئەوەی کە بترسێین باشترە بۆ بەرژەوەندیی خۆمان پێشوازی لە ئالوگۆڕ بکەین. ئەگەر هەست دەکەن لە حاندی ئالوگۆڕەکان خۆتان تووشی خەفەت و ناهومێدی دەکەن ئەوە بزانن خۆتان تووشی ئازاری دەروونی دەکەن! بە قەولی دوعای «جوبران خەلیل و دوکتور جتبوهێر» کە دەپاڕێنەوە: «خودایا، یارمەتیم دە ئەو شتانەی بۆ ئەوە دەبن ئالوگۆڕیان بە سەردا بێنم بە سەریاندا زاڵ بم و ئەو شتانەی لە توانامدا نییە بیانگۆڕم خۆیان لەبەر ڕاگرم و لە هەموو ئەوانە گرینگتر زانستێکم پێ عەتا کەی هەست بە جیاوازی ئەم دوو مەبەستە بکەم!»

٥) باوەڕەکان بە هێزن هەوڵ بدەن بۆ خولقاندنی باوەڕ لە سەرچاوەی جوان کەلک وەرگرن.

٦) دەبێ بزانین تەنیا ڕێگەی دەرباز بوون لە دلەخورپە و ترس ڕووبەڕوو بوون لەگەڵ گیروگرفتەکانە، خۆشاردنەوە، نەتەنیا گرفتەکە لانابا بەلکوو کۆسپێکە و نیگەرانی پتر پێک دێنێ و دەبێتە هۆی نەخۆشیی دەروونی. جگەرەکێشان، خواردنەوەی مەشرووبە ئەلکولیەکان و بە کار هێنانی مادەسڕکەرەکان دەبنە ئامرازێک بۆ دابین کردنێکی سەرەکی نەک بنەڕەتی ئەم ئالۆزییانە، ئەو شێوازە نالەبارە نەک گرێ ناکاتەوە بەلکوو گرێپووچکە دەخولقێنێ و زۆر ئاسەواری خراپی تاکی و بنەماڵەیی و کۆمەڵایەتیی بە دواوە هەیە.

ئەگەر ئەو کاتەی لەگەڵ ترس و خەفەتەکان ڕووبەڕوو بێن ئەگەرچی لە کردەوەدا کەمێک دژوارە؛ بەڵام لەسەر بیر و باوەڕی ئێمە شوێنەواری چاکی دەبێ و مرۆڤ هەست بە بەرزیی بیر و باوەڕ و خۆڕاگری دەکا. ئەگەر هەستتان بە تەنگژەیەکی زۆر کرد پێتان عەیب نەبێ لەگەڵ کەسانێک کە دەتوانن دەردەدڵ بکەن. چونکە ئەو دەردەدڵە دەروونتان سووک و بەتاڵ دەکا و بە گۆڕینەوەی بیروڕا دەگونجێ ڕێ چارەیەک بدۆزرێتەوە بۆ کردنەوەی گرێوگۆڵی پێکهاتوو.

٧) هەستەکان دوو بەشن: هەم مەترسیدار، هەم پڕ لە ئەوین و خۆشەویستی. دیارە هەست بە ترس و خەفەت جەستەمان نالەبار دەکەن، دلەکوتە و ئێش و ئازار لەشمان دادەگرێ، بەڵام

هەستی خۆشەویستی لەشمان سووک دەکا هەنگاو بە هێز دەکا و لە ئاکامدا شادی و سەرخۆشیمان بۆ دەبەخشێ کەوابوو چاکتر وایە ژیان سەخت نەگرین و زەین و بیرمان ئاواڵەتر کەین.

٨) ئایا پێتان خۆشە هەق بە خۆتان بدەن یا لە دەروونندا ئارام بگرن؟! هەموو رۆژێ خۆتان ماندوو دەکەن تاکوو بسەلمێنن هەق بە ئێوەیە بەڵام بزانن کەسایەتی ئێوە پربایەختر لەوەیە سەری خۆتان بە شتێکەوە قاڵ کەن کە بارودۆخی هێمنایەتیتان لە ناو بەرێ، ئەگەر کەسێک هەڵەی کرد لێی ببورن نەوەک لەبەر ئەوەی بایەخی لێبووردنی هەیە، بەڵکوو لەبەر ئەوەی خۆتان بایەخی، ئۆقرەگرتنتان هەیە. حافز گوتەنی:

(حافظ ار خصم، خطا گفت، نگیریم بر او

ور بحق گفت، جدل با سخن حق نکنیم)

واتا ئەگەر دوژمن هەڵەی کرد جێگەی گلەیی نییە (چونکە لە حاڵی بەربەرەکانی دایە و بیرۆکەی جیاوازی هەیە) ئەگەریش قسەی هەق بوو با دوژمنیش بێ هەقە و دەبێ بیسەلمێنین و لەسەری نەرۆین...

٩) خۆتان هەر وەکوو هەن بسەلمێنن، لە رەشبینی خۆ بپارێزن چونکە ئەگەر لە خۆتان دووشک و بەدبین بن دوچاری ناهومێدی و هەست بە گوناح کردن دەبن. ئەوەش دواکەوتویی کەسایەتی بە دواوەیە، ئەگەر لە دەوروبەریا کەسانی‌تر رەشبین بن، رق و کینە و توورەیی و نەحاوانەوەی لێدەکەوێتەوە. ئەوەش نەخۆشی دەروونی دەخوڵقێنێ. ئادەمیزاد ئەگەر کەم و کوورییەکانی خۆی لەبەرچاو بێ هەروەک هەموو تاک و مرۆڤێک هەیەتی دەتوانێ بە وردی کاریان لەسەر بکا و وردەوردە لەو خووخدانەی بوونەتە عادەت خۆ دەرباز بکا و کەسایەتییەکی پتەو دارێژێ.

١٠) خۆتان بە لێبووردوویی رابێنن، کەسایەتییەکان هەر وەکوو خۆیان کە هەن بگرنە خۆ، نەوەک ئەو جۆرەی ئێوە پێتان خۆشە بخوڵقێتەوە. لێرەدا باشترە بە جوانی ئاماژە بەم راستەقینەیە بکەین کە کەسایەتی هەر کەس لەگەڵ رەفتار و خدەیەکی هەیەتی جیاوازییەکی ئەوتۆی هەیە. بە داخەوە، ئێمە وامان عادەت گرتووە یا وایان قسە و باس بۆ کردووین کە تاک لەگەڵ کەسایەتی و رەفتاری تێکەڵ دەکەین ئەوەش دۆخی نالەباری لێ‌دەکەوێتەوە. گرینگ ئەوەیە بزانین کەسایەتی هەر تاکێک کاکڵی مرۆڤایەتی و ئینسانییەتە دەبێ ریزی بۆ داندرێ بەڵام ئێمە دەتوانین لەسەر رەفتارەکان کار بکەین یان قسە و باسیان لەسەر بکەین، بۆیە ئەگەر کەسێک یا تەنانەت منداڵەکەمان هەڵە بکا کەسایەتی لەگەڵ رەفتارەکەی یەک جێ

دینینە ژێر پرسیار و هەردووکیان دەڕوخێنین! ئەوەش کارێکی جوان نییە دەبێ منداڵەکەمان یا کەسەکە حاڵی کەین کەسایەتی تۆ هەر دەپارێزین؟ بەڵام ڕەفتاری تۆ ناشیاوە دەبێ بگۆڕدرێ یا کاری لەسەر بکرێ. جا خودا نەکا ئەو کەسە گەورەپیاو یا گەورە خاتوونێکی مەزن بێ، ئێمە دەبێ لەبەر چاومان بێ ئادەمیزاد بریتییە لە هەموو پێکهاتە و هەستێک کە چەلیوایە تووشی هەڵە دەبێ کەوابوو دەبێ بە شێوەیەکی مرۆڤ دۆستانە بۆ چارەسەر کردنی گرفتەکە هەنگاو هەڵێنین. بەو شێوەیە دەتوانین ڕێز بۆ مرۆڤایەتی دانێین و هێمنایەتی بخولقێنین.

ئاغای گاندی باوەڕێکی جوانی هەیە دەفەرمێ: «من بەناتەواوی هاوئەموعی خۆم کە منیش کەسێکم وەکوو ئەوان باوەڕم هەیە؛ هەرلەبەر ئەوەیە لە ڕەفتاری هیچ کەسێک شووڕە نابم. دەرمانێکی کە من پێمە ئەوەیە لە هەر شوێنێک هەڵەیەک بینم هەوڵ دەدەم بۆ چارەسەریی ئەم هەڵەیە، ئازاریش ناگەیەنم بەو کەسەی هەڵەی کردووە هەر وەک چاوەڕوانم بۆ ئەو هەڵانەی کە دایم تووشیان دەبم کەسێک ئازارم نەدا!»

١١) لە ڕووداوەکانی ژیان ئامۆژگاری وەرگرن، موعەللیم هەر ئەو کەسە نییە وانەی ئاسایی بە تۆ بلێ چەلی وایە هەڵسوکەوت لەگەڵ تاکێک و مرۆڤێکی خێرەسەر دەبێتە باشترین مامۆستا و دەرسی لێبوردوویی سینگفراوانیمان فێر دەکا.

١٢) سەبر و تاقەتتان هەبێ. سەبر یانی ئاگاداری تێکەڵ بە وشیاری واتا ئاوڕ دانەوە و سرنجێکی وشیارانە بە ژیان. هەوڵ بدەن ئەو چاوەڕوانییەی هەتانە گیرۆدەی رابردوو و داهاتووتان نەکا و بیرۆکەتان تێدا گیر نەخوا.

باشتر وایە هەر ئێستە بزانن چی دەکەن بە چاکترین شێوە لەو هەلومەرجەی کە هەیە کەلکی لێوەرگرن. ئاوا بە تەواوی دەتوانن ژیانتان مسۆگەر بکەن. ئەوەش بزانن بۆ جێگر کردن و سازکردنی خووخدەی باش و جوان تەنیا خوێندنەوەی بابەتێکی ئاوا یا چەند کتێبێک نە دەگونجێ نە دەتوانێ چارەسەریان بکا. بەڵام کاتێ ناهومێد بین ئەگەر بمانهەوێ کارێک بکەین و سەرکەوین دەبێ هەدا نەدەین چون ئەوەی بۆ ئێمە لە ئارادایە ئەسرەوتە هەرچی هەبە ڕۆیشتنە دەگەیەی، هەر کە برۆی تەنیا ئەگەر نەختێک برۆی!

## نامەیەکی دوو توێیی

خۆشەویستەکەم: ئێستاش بڕوا ناکەم، نازانم بۆ ئەم ژاراوەی دەرخوارد دام؟ تووی چ داخێ بوو لە ناخمدا چاندی ئەو هەموو خۆشەویستییەی ئەو، کە لە دڵما بوو، ئێستا دڵم بۆتە بۆغمە گەرووم دەگوشێ، بۆتە قینێکی ڕەش، خەزم و بیرەوەرییەکانی عومرم دەخواتەوە. چ زوو چەکەرەی دەرکرد و وەک جلە لەسەر شادەماری ڕۆحم ڕەگی داکوتاوە!

ئەو پیلانەی خۆی گێڕای. تێگەیی داخ و ژان و ئێشی ئەم ژاراوە نامکوژێ، من لە پێناوی خۆشەویستییەکەمدا بەرگەی هەموو ئەشکەنجە و ئازارێک دەگرم. ئێمە ڕۆژێک بە یەک ئەگەین، خەم نامێنێ، خۆشییەکان سەر هەڵدەدەن، خونچەکان بە بزە دەپشکوون تەرزی خۆشەویستی لەسەر ئەم ئەرزە ڕادەکێشین، وڵات داگر، تا چاو هەتەر دەکا گوڵی قاقا و پێکەنین دەم دەکاتەوە، ئاسمان ساف و پەڵە هەورێکی ڕەش نامێنێ. ئەوسا منیش پڕ بە سییەکانم بێنی خۆشەویستی هەڵدەمژم، بێن دەنێم بە پەرداختێکی لێواولێو لە ناونگی پەڕە ناسکەکانی ئەو گوڵانەوە، سەر خۆش، سەرخۆشی هەتا هەتایە. ئیتر بێ ئاگا دەبم، لە بارستای خەمەکانی ڕابردووم.

دوو غەزەل لە: ئەمین گەردیگلانی

## شەبەقی ناز

کووچە چۆڵ و شەبەقی نازێ لە پەنجێرە تکا
ئاسمان شەق بوو تکەی شەونمی ئەستێرە تکا
شەونمی واژە لەسەر کۆشی خەیاڵ بوونە شیعر
کە تریفەی بزە لەو لێوە گوڵاودێرە تکا
وتم : ئەی شۆخی بەدەو بۆ خەمی تۆ بوومە هەور
وەرە ئەم تک تکی فرمێسکە بژمێرە، تکا
ئاوری بەرداوەتە دڵ پێلی گڕهاوێژی نیگات
بکە ڕەحمێک و بە تاڤگەی فڕژەوە بێرە تکا
مەمکەکەت بگرە لەبەر حاکمی دڵبەردی حەزت
بۆ گرێ دانی دڵ و وەسڵی ئەوین خێرە، تکا
سەرم هەڵگرت و لەبەر دەرکی ئەوینیم دانا
دایە بەر شەق وتی پێم: باوی نیە لێرە تکا
من نیگام برسییە بۆ دینی گوڵی ڕووت و کەچی
لە نیگات شەونمی ماچی ئەوی چاو تێرە تکا
بوومە تاوێکی سڕی کەوتوو و لە نێو کووچەکەتان
چابوو تیریژی بزەت هات و لە پەنجێرە تکا.

# ڕووناکی

تا دڵی ئێمە لە سایەی هونەرێ ڕووناکە
شەوی ئاواتی هەموو خەم لە بەرێ ڕووناکە
وەشەوارەی دەکەوێ چاوی زەمان، زۆر بێ نوور
تا ژیان پڕ لە شەوە و چەرمەسەرێ ڕووناکە
تاکوو باخی گوڵی هیوایە هەبێ و تینوو بێ
چاوی ئەسرینی هەموو دەربەدەرێ ڕووناکە
بەسیە ڕەشبینی تەمی خەم لە دڵت دەرباوێ
کانی فرمێسکی لە فوڕ دێتە دەرێ، ڕووناکە
دەنکە بارانە لە نێو ڕۆحی ڕەشی هەورایە
بۆ خەمی پیرە زەوی دادەوەرێ، ڕووناکە
خۆر، کە بۆ ماچی زەوی دانەگەڕێ ناشلوێ
ماچی ئەستێرە بکا هەر لە سەرێ، ڕووناکە
مانگی ڕووت جووتە لە بن دوو پەڵە هەوری ڕەشدا
بە نیگای خۆری مە هەر یەک لە بەرێ ڕووناکە
چاو لە من داگری چاوت بە گەشی هەڵدێنی
تاکوو ئەستێرە مژۆڵی دەلەرێ، ڕووناکە

## ساڵنامە

بەهارە و «خاکەلێوەی»، لێوەکانی من چ پڕ بارە
هەتا مانگی «گوڵان» دیت و لە سەحرا گوڵ لە گوڵزارە
بە زەردی زردەخەندەی، ڕۆژە «جۆزەردانی» ڕەنگینە
بەهار لەم کاتە پڕتینە، گەلی تینوو بە ئەسرینە
هەتا هاوین، هەتاو، هێزی لە «پووشپەڕ» بەرزە ئاکاری
«گەلاوێژ» میوە بەر دێنی، درەختی سەوزی پڕ باری
لە خاک و خۆڵی «خەرمانان»، شنەی شەن دێ بە دەم باوە
کە کیژی کوردی لادێیی، سەراپا تۆزی سەرداوە
لە وەرزی پاییزا «ڕەزبەر»، ڕەزی ڕێبازی ڕازاوە
«خەزەڵوەر» خاوخێزانی، خەزانی زەردی هێناوە
وزەی سەرما، لە «سەرماوەز» کە سۆزی وەرزی سەرمایە
گەڵاڕێزانی زێڕینە و گەلێ ڕازی لە سەردایە
لە بەفری، بەرفراوانا، چ زستانێکی مەستانە!
کە «بەفرانبار»ی باری بێ، کڕێوەی وەرزی زستانە
ڕموەز ڕێگا، لە «ڕێبەندان»، لە کوێ دەگرێ، کە ڕێژانە؟
مەگەر نازانی ئەم وەرزە، هەژانی وەرزی هەستانە؟!
شەماڵ ڕەشماڵی ڕەش هەڵکا، «ڕەشەمەی» ڕەش دەتارێنێ
هەتا «سارۆخ» بە ئەسرینێ، بەزارەی گەش دەبارێنێ

حوسێن شێربەگی

## ئەفسانە! بۆچی؟!

لە خەزێنەی فۆلکلۆردا وەکوو گەنجێکی بە بێ کۆتایی، ڕەنگە بەشی هەرە شیرین ئەفسانە بێت. چونکە ئەفسانە هەم ڕاستی و واقعیە، هەم خەون و خەیاڵ و فانتازیا. هەم قسە و باسی مێژوو و ڕابردووە و هەم باس و خواسی ئەمڕۆیە. هەم سەربوردی ئەناسیاویان و ئەدیتووانە و هەم سەرگوزەشتی دۆست و دیوناس و خزم و کەسانە. هەم گێڕانەوەی سەربوردانە، هەم لێکدانەوەی چارەنووسانە. هەم باسی دیترانە و هەم قسە و باسی خۆمانە! هەم و... هەم و...

دەیجا بە پێی ئەم بۆچوونانە ئەفسانە لە دێرزەمانەوە یانی لە ڕابردوویەکی دوورەوە تا هەنووکە شیرین و خۆش و لەبەردڵان بووە و هەروا خۆش و شیرین و لەبەردڵانیش ماوەتەوە.

ئەفسانە لە زاتی خۆیدا، خەون و خۆزیا و خەیاڵ و خولیای گەیشتن بە ڕزگاری و عەداڵەت و یەکسانیە لە لایەن مرۆڤەوە، بە گشتی و لە لایەن خەڵکی ڕەشۆکیەوەیە بە تایبەتی. بایەخی ئەفسانە لەوەدایە کاتی ئەفسانە گێڕانەوە بۆ جەماوەرێک، یان کاتی گوێ شل کردن بۆ ئەفسانە و ئەفسانەخوانی، هەم کات و زەمەن بە خۆشی تێپەڕ دەبێ و هەم ڕاهێنان و ڕاهاتن و فێر بوون و زانست و زانیاری لە گۆڕێدایە.

ئەمە وانە و دەرسی مێژووە نە ئەوانەی وا دەوڵەتیان پێکهێناوە و خاوەن دامودەزگا و ڕێکخراوە و پێکهاتەی فەرمی و حوکوومی و نەتەوەیین زوو لە کەلتوور و ئەدەب و هونەری نڤیساری دەچن و لە ئاکامدا فۆلکلۆر و فەرهەنگی زارەکی ئەمانە زۆر بەربڵاو و هەمەڕەنگ و دەوڵەمەند نییە، بەڵام نەتەوە ژێردەست و چەوساوەکان کە زۆربەشیان سێبەری دەوڵەتی نەتەوەییان بە سەرەوە نییە و بەستێن و بواری پێکهێنانی فەرهەنگ و ئەدەب و هونەری نڤیسارییان بۆ نارەخسێ، ئەم چەشنە نەتەوانە دەبنە خاوەن کەلتوور و فۆلکلۆر و ئەدەب و فەرهەنگی زارەکی زۆر زۆر ڕەنگین و بەربڵاو و بەهێز و دەوڵەمەند.

دەسا گەل و نەتەوەی ژیر و هۆشیاری دەوێ هەتا هەلودەرفەت بقۆزێتەوە و لە هەر هەلومەرجێکدا کە بۆی دەرەخسێ، فەرهەنگ و کەلتوور و فۆلکلۆری خۆی گردوکۆ کاتەوە، لە قەوارەی کتێب و دیوانە شیعر و فیلم و سی‌دی (CD)دا تۆمار و ئارشیوی کات، بڵاوی کاتەوە، بیانباتە نێو جەماوەرەوە، بە تایبەت بیانباتە نێو بەرەی نوێ و تەمەن‌ساوا و مێرمناڵ و گەنجەوە، کە ئەم بەرە و جیلە لە پێشینە و فەرهەنگی خودی خۆیان دانەبڕێن.

نەتەوەی ئێمە (نەتەوەی کورد) لەو نەتەوەیە کە بە درێژایی زەمەن، خاوەن مێژوویەکی پڕ هەوراز و نشێو و پڕ لە بەزم و ڕەزم و هەڵچوون و داچوون بووە. بە تایبەت ژیانی عەشایەری

و خێڵاتی و کێونشینی و گوندژمەنی بەو هەموو هەڵا و زەنا و شەڕ و بەربەرەکانییە دەگەڵ دەرودراوسێ و نەیارانەوە، بۆ مانەوە، بۆ بژیو و نەفەوتان و ڕزگاری و زۆر فاکت و فاکتۆری دیکەشی لەگەڵدا بێ، ئێمەی کردۆتە خاوەن کەلتوور و فۆلکلۆرێکی ڕەنگاوڕەنگ و دەوڵەمەند. هەزار مەخابن کە ئەم سەروەت و سامانە لە سەدا یەکی کۆ نەکراوەتەوە، تۆمار و ئەرشیف نەکراوە، زۆر سروشتییە کە زانست و زانیاری و زانستیشمان لەسەر ئەم بابەتە کەم بێ یان نەبێ!

بە داخەوە ئەوەندەی فەرهەنگی زارەکی نەتەوەی کورد دەوڵەمەندە (بە تایبەت لە مژار و بوار و بەستێنی ئەفسانەدا) هەزار ئەوەندە و بگرە زیاتر زانستی ئەفسانە ناسینمان هەژار و لاوازە.

ویلادیمیر پراپ، ئەفسانەناسی ڕووسیا لە کتێبی (قەوارەناسینی ئەفسانەکانی پەری) دەبێژێ: «لە کەش و هەوایەکدا زانستێ وەکوو فیزیا، کیمیا و ماتماتیک، خاوەن کۆلێج و ئاکادیمی و زانکۆ و کۆنگرە و فیستیڤاڵ و پۆلێن کردنی ڕێکوپێک و زاراوەی یەکگرتوون و لە کۆنفرانس و میهرەجان و کۆنگرە زانستی و پسپۆڕییەکاندا دەنووسرێتەوە و لە لایەن مامۆستایانەوە بۆ قوتابیان دەگوازرێنەوە. ئێمە کارێکی ئاوامان نە لە چیرۆک و نە لە ئەفسانەکاندا نییە و جۆراوجۆری و ئاڵۆز بوونی کەرەسەی کار و بیچم و چارەسەر کردنی گیروگرفتی ئەفسانە بە وردی هەر دێ و دژوارتر دەبێ.»

ئەمە هاواری مامۆستایەکی گەورەی بوار و بەستێنی ئەفسانەناسین لە وڵاتێکی پێشکەوتوودایە کە دەڵێ: نە بە تەواوی چیرۆک و ئەفسانەکانمان کۆکردۆتەوە و نە هیچ کارێکی پسپۆڕانەمان لەسەریان کردووە، دەبێ حاڵوباڵمان لەم مژارەدا چۆن بێ؟ ئەوەتانێ هەر بە هۆکاری ئەم کەمتەرخەمییەوەیە کە چیرۆک و ڕۆمان نووسینی کوردی لە پاش نیزیکەی سەد ساڵ چالاکی و هەوڵ و تێکۆشانی نووسەرانمان ناچێتە ماڵپەڕ و قەوارەی هونەری پەسەندەوە و مۆرکی کوردی بوونی پێوە نانووسێ.

گلەیی و بناشت و ڕەنج و خەفەت و هاوار و بڕۆ زۆرە، و دەرفەت کەم. ئێرەش بابەتی وتار بۆ ئەفسانەیە، نەک بۆ ڕەنجنامە. کورتی دەبڕینەوە و با بمێنێ بۆ شوێنی خۆی و وتاری خۆی و کاتی خۆی.

مرۆڤی کۆمەڵگا نادیمۆکراسییەکان خەون و خۆزیا و خولیاکانیان لە قەوارەی ئەفسانەدا دەربڕیوە. ئەفسانەکان کە لێوڕێژن لە جوانی، هونەر، عەدالەت پەروەری، یەکسانیخوازی و بگرە قوتابخانەیەکن بۆ گەشە و پەرە پێدانی ڕاهێنانی هێزی ئافراندن و داهێنانی جوانی و هونەر و فێرکاری و فێر بوونی هزر و فیکری فەلسەفی و کۆمەڵایەتی و یەکسانیخوازی و

برایەتی. لە ناو ئەفسانەدا زۆر جار «پادشا» زاڵم و بێ کەڵک و بێ خێرە و جەماوەر لە ناخۆشەویستی شادا، شا بە وەجاخ کوێر دادەنێن و هەموو گێڕانەوەی ئەفسانە دەبێتە ئاواتخوازی بۆ لە دایکبوونی شازادەیەک کە پیاوچاک و مرۆڤپەروەر بێت و هەر کاتێکیش زوڵم و زۆری (میری- شا- حاکم) لە ڕادە و ئاستی تابشت هێنان تێپەڕ بوو، ئەوا جەماوەر، «پادشا، حاکم» بە ئەژدیها و دێو دەشوبهێنن و دەستەودۆعای سەرهەڵدان و ڕاپەڕینی سوارچاکێکی جوامێر و ئازا دەبن، تا ڕاپەڕێ و ناحەزان (پادشا- حاکم - ئەژدیها- دێو- جادووگەر) لە دەسەڵات بخات و لە ڕاستیدا شوێنەوارەکەی لە ڕووی زەوی بسڕێتەوە. بەڵام دەبێ خۆمان بەخسیری ڕاڤەی-واتای ئەفسانە نەکەین، چونکە لەم کورتە وتارەدا کە زیاتر بۆ مژوولیایش و گوتار نووسراوە، ناکرێ و ناتوانین ئەم شیکارییە بە ئاکام و ئەنجام بگەیەنین.

بۆ ناسینی ئەفسانە دەچینە سەر وەسفێک و پۆلێن بەندییەک کە یەکێک لە پسپۆڕانی ئەم بوارە ئەفسانە لە سێ چەشندا پۆلێن دەکا:

١. ئەفسانەی پەری و جنۆکە

٢. ئەفسانەی ژیانی ڕۆژانە

٣. ئەفسانەگەلی سەبارەت بە گیانلەبەرانی دیکەی بێجگە لە مرۆڤ وەکوو باڵندە و ئاژەڵ و درەخت.

بەڵام ئەم پۆلێن کردنە لە لایەن کەسانێکی وەکوو «ئافاناسیێف»ی نووسەری وڵاتی ڕووسیاوە کە زیاتر لە چوارسەد ئەفسانەی گردوکۆ کردووەتەوە و لە قەوارەی کتێبدا بڵاوی کردوونەوە، ڕەفز کراوەتەوە. بۆ چی؟ لەبەر ئەوەی لەم پۆلێن کردنەدا تەنها کەسێتی ناو ئەفسانە لەبەر چاو گیراوە، کەچی دەبایە پێکهاتە و بنەماش لەبەر چاو گیرابایە.

ناسینی ئەفسانە و سەرەودەرەی پۆلێن کردن و واتاکان و چێژ بردن لە جوانی هونەریی و جوانی زەین و خەیاڵات و خۆزیاکانی نێو ئەفسانە، ئەرکی نووسەران و دای و باب و مامۆستایانە؛ چونکە گێڕانەوەی ئەفسانە وەک دیالۆگی ئەدەبی و هونەری بۆ جەماوەر و کۆمەڵگا - نەک هەر بە چەشنێکی زارەکی- بەڵکوو بە نووسین و بڵاو کردنەوە و خوێندنەوە و ڕاڤە کردن و مژوولیا و دیالۆگیش لەگەڵدا بێ، لە گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاڤۆکدا، بە وانە گوتنەوە لە یانەکاندا لە قەوارەی کتێب و فیلم و سی‌دیدا لە لایەن مامۆستایان و نووسەرانەوە، هەروەها ئەفسانە گێڕانەوە لە لایەن دای و باب و داپیرە و باپیرە و خوشک و براگەورەوە بۆ منالان و مێرمنالان، تێفکرین و تێڕامان و هێزی هەست و سۆزی ئەدەبی و هونەری و جوانی ناسینی هونەر و ئەدەب و هەست و سۆزی جوامێری و ڕزگاریخوازی و ویستی یەکسانی و

دیمۆکراسی و دادپەروەری لە جیل و نەوەی داهاتوودا بە توانا و پەروەردە دەکا و رایان دەهێنێ و منال و مێرمنال و گەنجەکانمان بەرەو کەلەپوور و کەلتوور و فەرهەنگی نەتەوایەتی و بەرپرسایەتی و ئیش و ئەرکێکی بایەخدار دیوناس و ڕێتوێتی دەکات و هەروەها توانای ئەدەبی و هونەری و خەیالاتپەروەریی منال و گەنج بەم کارە بەهێز دەبێ.

ئەفسانەی نەتەوە جیاوازەکان لێک دەچن، زۆر جار ئەفسانەیەک لە نێوان چەند وڵاتدا هاوبەشە، ڕەنگە بە بێ ناو بردنی وڵاتێک، وڵاتی خاوەن ئەفسانە باش نەناسرێتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە قسەی دڵی نەتەوە جیاوازەکان یەک قسەیە، ئاوات و هیوا و خۆزیاکانیش هەر وەکی یەک وایە. ئەرک و بەرپرسایەتی ئێمە گردوکۆ کردنەوەیانە، کەڵک وەرگرتن لەم ئەفسانانە بۆ داڕشتنی چیرۆکی نوێیە و پاراستنی ئەم سامانەیە لە فەوتان.

لێرەشدا جارێکی دیکە درووود و سڵاومان بۆ گیانی پاکی مەلا مەحموودی بایەزیدی، ئەحمەدی خانی و هەریری و بەردەشانی و فەقێ تەیران و ...

دەبا ئێمەش ئەرکی خۆمان لەم بەستێنەدا لە یادا بێ.

**سەرچاوە**


۱. ریخت شناسی قصه، ولادیمیر پراپ، ترجمه م. کاشیگر، تهران، نشر روز، ۱۳۶۸

۲. وضعیت پست مدرن، ژان فرانسوا لیوتار، ترجمه حسینعلی نوری، تهران، نشر گام نو، ۱۳۸۰

۳. کتاب کوچه، احمد شاملو، نشر مازیار، تهران، ۱۳۷۵تا۱۳۸۴

٤. داب و نەریتی کوردی و ٤٠ حیکایەتی مەلا مەحموودی بایەزیدی، دوکتور فەرهاد پیربال و پێداچوونەوەی عەزیز داشبەندی، وتارەکانی دوکتور فەرهاد پیربال

٥. ئەفسانە و ئەفسوون، برۆنۆ بێتلهایم، وەرگێرانی مامۆستا هێمنی موکریانی، بڵاوکراوەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا

شاعیر: لەیلا سالحی

## تا سنووری فانووسەکان

زەمان هەموو سبەینێ‌کانم دەدرەوشا
لە دەنگی مندا تۆی گرت زەمان بەش بەش
زەمان بووی و
لە گەڕانەوەدا
پێوانەی شکۆی غەم: قەڵەمەکەم
سپێدەیەک لە دارە مێژوویییەکان
باڵندەکانی پەنجەرە و
سەرکەوتوویەکی پاییزی
یادگاری ئەو دەستانە بوون کە خۆر تێیدا ئارامش بوو
لە تۆوە تا
من دەناسرێم بە کانی
ئەستێرەیەک (مەزنتر لە هەڵفڕینی مەستانەت)
شکا لە من
داگیرساو وەک ئاڵای خوێن
مۆمێکی سەربڕاو بووم من
بێڕەحمانە خۆمم نۆشی
لە دەستەکانت نەپرسی
تا پەپوولە من بارانی
چ وڵامێک بۆ سبەینێی غوربەتەکانی من و مانگ؟
نەپشکووتن تەنانەت پەرەنگێک
ئێوارەکان ... سروودی من
لە کوێ ون بوون شیعرەکانم ئەگەر دەبوون بە سێ هەتاو
من ڕۆژانە لە سێ ڕووناکایی وندا دەستەکانم دەگەنە خاچ
سبەینێ داهاتووەکان من بەرەو خۆر
دەستم دەبن بە ئایەتێک
ئایەتێک بۆ شکۆی پاییز

ئەو ساتانەی دەمارم بوون بە خەزەڵوەر
سبەینێ مێژوویەکان لە ناو خۆردا
دەستم تاریک دەدرەوشێ
لە خوێنمدا کسووف دەبێ هاواری من
بۆو ساتانەی بۆنی باڵندەم لێ دەهات
سبەینێ ڕابردووەکان بە شوێن خۆردا
دەستم دەبن بە دووکانێ و
تا دەگەنە خۆم دەخنکێن
بۆ سوپاسی ئەو ساتانەی تینوو تینوو چراخان بووم.
کێ دەناسێ
کە من پاییزی باڵندەی دوو کانی بووم
من باڵندەی کانییەکانی شکۆی پاییز
ئەوڕۆش کانی پاییزییەکی بێباڵندەم؟
لە دارەکاندا پشکووتین
لە چوارچێوەی مەعسوومترین پەنجەرەکانی غەریبی
لافاوی گوڵە گەنم بوو لە دەنگیا
حەبەسابوون دەستە بارانییەکانی من
لە هەر دوو چاوی مانگەوە
دەستەکانم لە قیامدا
ئاوێنەیەکیان گرتبوو بەرەو خودا
من و دەنگی سبەی ڕەش بووین
ئاوێنە نەیدەناسی
دەستەکانم چ مەحشەرێکی شووم نەڕوێن.
بێواتا بوون
بزەکانی ئەم درەختە
پاش سەفەری حەماسەی خوێن بۆ گیانی ئاو
بۆنی خاکێکی ونیان گرت و
ئەو سبەینێیەکی نەزانراو

لە من درەنگ... دەستەکانی
بێ دەرفەت بوون دەنگ‌دانەوەی شکۆفەکان و
عەهدێکی چەوساوە بوو کاتێ ون بوون
لە سەمای کۆتاترین نەورۆز و
ئەستێرەکانی ناو دەممی بێ تەمەن کرد...
سەرنەکەون لە پاش پاییز، شکۆفەکان
درەختەکان بێ‌هەویەن و
باران!...؟
دڵتەزێنە شیوەنی ئاو
بەهاری ٢٠ ڕۆژی‌تریش
ناوادەیە بۆ دووپاتەی درەختەکان
(ئەوانەی خودایان دەکوشت)
(ئەوانەی خودا کوشتنی)
سەرنەکەون سەربازە بێ شەڕابەکان
ئەویش تا ساردترین دێرەکان با بڵێسە بێ
ئەم دوو هێڵەی خوارترەوە بەستەڵەکە
لەشی وشەی ئاگرینی جوامێرانە وەخۆ نەگرت:
***

**بیان بوون**

ئەدرەوشای
ئەگەر سڵاوێکی سپی تا ئەفسانەم
چ جیاوازییەک لە نێوان سپێدەکان و ناوی من
ئەگەر «هەژان»
تا کۆتایی منی بچووک
ئەدرەوشای
بیستنی من، بیستنی تۆ
گرانترین ڕووناکی بوو
درەختێکی گڕ گرتوو بووی

چاوی گەلات دەوەریـیە ناو خەزەلوەری خوێنمەوە و
ئەدرەوشای.
ڕووناکم کە
قورسترە لە مێژوو
ئەو وڵاتەی دوو سێوی سوور
سەنای یەکتر ستران ئەکەن بە مارشی نوێ
خودا بگرێ ئەو پێلووەی تێیدا هێور
دوو باڵندەی نوقیلنووسی هەڵدەفرێنە ناو یەکەوە
ڕووحەکانیان لە ئاو ڕووتتر
ڕووناکم کە تا سنووری فانووسەکان
بڕوا مەکە نەفرەت بکەی لە تەمەنم
کە دەستی تۆ
لە من هەر سات... باڵندەیەک.

## سێ کورتە شیعر لە: یونس ڕەزایی

### موعجیزە

لە موعجیزەی مندا کە پێغەمبەرێک نەبام ـ ئەگەر
هەزارویەک مار بە جەرگەی وشەوە
لە خەونی شیرینترین گۆچاندا

هەزارویەک سیحر بە کەلامێک لە چەشنی ئاودا
لە خولیای تینووترین کەسانمدا... سەر سوڕماو

لە موعجیزەی مندا کە شاعیرێک بم ڕەنگە لە دوێنێ
بە گۆچانێکی ڕاستگۆوە
هەزارویەک دەریا لە خۆمدا
دەنووسمەوە
شین
هەزارویەک شەپۆل بە تەعبیری ئەوینی ئالایەک...

سەرم سوڕما لە کەلامی پێغەمبەرێک
کە گۆچانی هەزار شاعیری هۆنییەوە
لە تینوێتی سەرسوڕماندا.

منیش وەها شاعیر دەبم لە موعجیزەی کەلامێکدا
کە وەک دەریایەکی ڕاستگۆ
هەزارویەک شەکانەوە بە تینوێتی و
سیحرێک بە ئەوینی وشە...
وەها شاعیر
کە سەری مار سوڕ بمێنێ لە تینوێتیم.

***

**خەرمانە**

سینگت دادەڕووشێ بە نزای شەو
بە زاری بێبەری
لە هیچ پیتێکی بە مانا و
بە مەودا...

سینگت دادەپۆشی بە سزای دارستان
بە شەپۆلی بزەی هەموو دیرە تەڕەکان...

دیری شەپۆلێک لەسەر سینگت
بزەی دارستان و
سزای شاعیر....

بە مەودای مانایەکەوە دەتلێمەوە
کە هەموو پیتێکی هەر داپۆشراو
نەک ڕووت و ڕووناک
وەک سینگت
کە هەموو شەوێکی بێبەری...
نەک خەرمانەیەک بە دەوری هەستیتدا و
دەربەدەر هەڵاتوو
لە نزای ئەوبەری ئاسۆیەک .
وەک مانگێک بە ئاسۆی سینگتدا
خەرمانە دەدەم و
تا نزای پیتێکی دەربەدەر
حاشامە لە مەودای... ئاوا بوون.

●●●

## نا ـ دڵنیا

شڵەژاوم و
بەو دیوی کارەساتەوە پەلە دەدەم... ڕەنگە
ئاڵۆزاوم و
بە لاپەڕەی هەزار و چەندەمی مەرگەوە... پەیوەستم...
ئاخۆ
بریندار و
بە سەر باڵی ژانەوە دەفڕم.
ئاخۆ هەزار و چەندەمین لاپەڕەی فڕینم
پڕ پڕ پڕ دەبێ لە باڵ.

شڵەژاوم و ڕەنگە بە باڵی مەرگەوە پەلەم دابێ و
کارەسات لەو دیوی برینەکانمەوە
بفڕ فڕێ...
ئاڵۆزاوم و
پەیوەستم بە لاپەڕەی ئەو دیوی تەنیایی‌یەوە
ئێستا.

***

ئامادە کردنی: ئیرەج ناهید، مستەفا ئیلخانی‌زادە

## نووسەران و هونەرمەندانی هۆزی فەیزوڵڵابەگی

هۆزی فەیزوڵڵابەگی، یەکێک لە هۆزە گەورەکانی کوردە کە لە ناوچەی موکریان لە شارەکانی بۆکان و سەقز و مەهاباد نیشتەجێن، ئەو خێڵە گەورە، پیاوی بە ناوبانگ و ئازا و سەخی و شاعیر و نووسەر و مێژوونووس و هونەرمەندی زۆر بووە و ئێمە لێرەدا تەنیا ئاماژە بە قەڵەم بەدەستان و هونەرمەندانی دەکەین. بۆ شانازی ئەم هۆزە تەنیا ئەوە بەسە عەبدوڵڵاخانی ناهید(ئیفتیخار)کە یەکێک لە ناودارانی ئەم هۆزەیە و لە بواری نووسین و شیعر و نەققاشی و ئوتۆبیوگرافیدا بە ناوبانگە. لەو کەسانە بووە کە ڕۆماننووسی بە شێوەی ئورووپایی هاوکات لەگەڵ چەند کەس لە نووسەرانی ئەو سەردەمەی ئێران وەک کازم‌زادە ئیرانشەهر و حوسێنقولی موستەعان و سادقی هیدایەت دەستی پێکردووە و ئێستاش پیاوی زانا و ئەدیبی گەورەیان وەک مامۆستا حەسەن سەلاح (سۆران) زۆرە.

ئێمە لێرەدا جێی خۆیەتی کە دەسخۆشی لە کاک ئیرەجی ناهید (شاعیر و مێژوونووس) و یەکێک لە ئەندامانی بە ناوبانگی کۆڕی فێرکاری و فەرهەنگیی ئەدەب بکەین کە بە نووسین و لە چاپ‌دانی کتێبی بنەماڵەی «عەبدوڕڕەحمان بەگی موکری» توانیویەتی تا ڕادەیەکی زۆر مێژووی ئەم هۆزە ڕوون بکاتەوە و شاعیران و نووسەران و هونەرمەندانی بە جەماوەری خەڵک و ئەدیبان و مێژوونووسان بناسێنێ. لێرەدا بۆ ناسینی هونەرمەندان و ئەدیبانی ئەو هۆزە تا ئەو جێیەی ئاگامان لێیە و زانیاریان پێداوین، وا چەن کەسێکیان ناو دەبەین.

١ـ خوالێخۆشبوو حاجی سلیم‌خان مەشهوور بە حاجی سەرتیب، شاعیر و نووسەر.

٢ـ خوالێخۆشبوو حاجی عەبدوڕڕەحمان‌بەگی شاریکەند مەشهوور بە حاجی ئیلخانی، شاعیر.

٣ـ خوالێخۆشبوو ئامانەڵڵا بەگی ئالبلاغ مەشهوور بە شەیدا، شاعیر.

٤- خوالێخۆشبوو عەبدوڵڵاخانی ناهید مەشهوور بە ئیفتیخار، نووسەر، ڕۆمان نووس، نەققاش، هونەرمەند و مۆسیقار.

٥- خوالێخۆشبوو فەیزوڵڵاخان ناهید، نەققاش و مۆسیقار.

٦- خوالێخۆشبوو حاجی برایم‌خان سەلاح، نووسەر، زمانەوان، فەرهەنگ نووس، ڕیازی‌زان و شیمی‌زان.

٧- خوالێخۆشبوو دوکتۆر عەلی گەلاوێژ نووسەر، شاعیر و توێژەر.

٨- خوالێخۆشبوو مامۆستا حەسەن سەلاح سۆران، شاعیر، نووسەر، زمانەوان، ئەدیب و لێکۆڵەر.

٩- خوالێخۆشبوو دوکتور سولەیمان ئەنەوشیروانی، سەردەبیری ڕۆژنامەی سەحەر و باستان، نووسەر و توێژەر و ڕۆژنامەنووس.

١٠- خوالێخۆشبوو محەممەدخانی سەلیمیبابامیری مەشهوور بە سیهامولمولک، خۆشنووس.

١١- خوالێخۆشبوو عەزیزخانی کرمانج، نووسەر و زمانەوان.

١٢- خوالێخۆشبوو سەعیدخان هومایونی، نووسەر.

١٣- خوالێخۆشبوو عەبدوللاخان(سالاری ئالبلاغ)، نەققاش.

١٤- ئیرەج ناهید، شاعیر، نووسەر، مێژوونووس.

١٥- موهەندیس فارووق کەیخوسرەوی، نووسەر.

١٦- عەبدوللا کەیخوسرەوی، مێژوونووس و لێکۆلەر.

١٧- شاهرۆخ فەیزنژاد، مووزیسیەن، نووسەر، پەیکەرتراش- نەققاش.

١٨- خوالێخۆشبوو ڕەشیدخان کەیخوسرەوی، مێژوونووس.

١٩- خوالێخۆشبوو سەعیدخان ئەدهەمی، نووسەر،تەحلیل گەر.

٢٠- خوالێخۆشبوو عەلیخان بابامیری، شاعیر- قسەخۆش .

٢١- خوالێخۆشبوو عەلیخان سەلیمی بابامیری(پەشێو)، شاعیر.

٢٢- ناسرخان فەیزوللابەگی، نەققاش.

٢٣- محەممەد ڕۆستەمزادە، نەققاش- پەیکەرتراش.

٢٤- خوالێخۆشبوو ئیبراهیمخان ناهید، نووسەر و نەققاش.

٢٥- محەممەدخان ناهید، نووسەر، ئەدیب، نەققاش، ئاکتۆری سینەما مۆسیقار و هونەرمەند و دەنگ خۆش.

٢٦- ڕەزا ئەدهەمی، شاعیر.

٢٧- موزەفەر بابامیری(هەژان)، شاعیر.

٢٨- ڕەشید فەیزینژاد، مۆسیقار و دەنگخۆش.

٢٩- حەسەن دەرزی، مۆسیقار و دەنگخۆش.

٣٠- خوالێخۆشبوو عەبدوللا بەگ نیروومەند، شاعیر.

٣١- مستەفاخان شیرزاد، نەققاش.

٣٢- نادر نیروومەند(بۆران)، شاعیر .

٣٣- خوالێخۆشبوو عەزیزخان کەیخوسرەوی نووسەر، شاعیر و مێژوونووس.

نووسین و ئاماده کردنی: مستەفا ئیلخانیزادە

## کورتە باسێک لەبارەی زمان و زمانەوانییەوە

یەکێک لە تەوەرەکانی ئەو وەرزنامەیە زمانەوانییە. یانی لێدوان لە بارەی زانستی زمان و زمانەوانی و ڕێنووس و ڕێزمان و ئەو شتانەی پێوەندییان بە زمانەوە هەیە. لێرەدا ئێمە ئەو باسە دەس پێدەکەین و لە ژمارەکانی داهاتووشدا درێژەی پێدەدەین.

## زمانەوانییان زانستی زمان

زمان یەکێک لە بناغە گرینگەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و هۆی پێوەندی نێوان مرۆڤەکانە لە کۆمەڵگادا. زمانەوانی یان زانستی زمان، یانی لێکۆڵینەوەی زمان. زمانەوانی بە دوو بەشی سەرەکی هاوکات(همزمانی) و لە زەماندا(در زمانی) کە بە دوو بەشی زمانەوانی تاک(فردی) و مێژوویی(تاریخی) دابەش دەکرێ. لێرەدا تەنیا باس لە زانستی زمانەوانی هاوکات دەکەین و کارمان بە زمانەوانی مێژوویی و تاک نەداوە.

## زانستی زمانەوانی هاوکات

زانستی زمانەوانی هاوکات وەک هەموو لقێکی دیکەی زانست زۆر بەربڵاوە و کاری زۆر لەسەر کراوە. لەو باسەدا دەمانهەوێ لە چەند بەشی زانستی زمانی هاوکات بە شێوەی سادە و هاسان بۆ ئەوانەی دەیانهەوێ لەو بوارەدا زانیارییان بێ، بدوێین. و بە کورتی باسی ئەم بوارانەی زمانەوانی هاوکات: فۆنێتیک (آواشناسی) فۆنۆلۆژی (واج شناسی) مۆرفۆلۆژی (تکواژشناسی واتە صرف) سینتاکس(نحو) و سیمانتیک (ارتباط معنایی) بدوێین.

### فۆنێتیک(ئاوا شناسی)

کاتێک یەکێک قسە دەکا ئەو زانیارییەی کە لە مێشکیدا پارێزراوە دەخاتە قالب و چوارچێوەی ڕیزە دەنگێکەوە، کە بە ئەندامانی ئاخاوتن(ناتیقە) دروستیان دەکات. دەنگەکان بە هۆی شەپۆلەکان لە هەوادا دەگوێزرێنەوە. گوێ وەریان دەگرێ و حەواڵەی مێشکیان دەکا. مێشک شییان دەکاتەوە و دەیانپارێزێ. واتە قسە بەلانی کەم سێ قۆناغی هەیە.

قسەکەر ——◄ شەپۆلەکان ——◄گوێگر

فۆنێتیک ئەو لقەی زانستی زمانە کە لە دروست کردن و گواستنەوە و وەرگرتنی دەنگەکانی زمان دەکۆڵێتەوە، وەک دیاردە(پدیدە)یەکی گشتی. واتا دەنگەکانی زمان دەبێ لە سێ گۆشەوە چاویان لێبکرێ و لێیان بکۆڵرێتەوە:

١- لە ڕووی دروستکرنەوە Articulary phonetic

ئەوە میکانیزمیەتی ئەندامانی ئاخاوتن دەگرێتەوە (چۆنیەتی ویککەوتن و ڕادەی ئاواڵەبوون و داخراوی).

٢- لە ڕووی چۆنیەتی گوێستنەوەی دەنگەکان لە هەوادا بە هۆی ئەو شەپۆلانەی بە هێزی ڕەوت و فشاری بای لە سیەکانەوە هاتوو و جووڵانەوەی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست دەبن. Acustic phonetic

٣- لە ڕووی وەرگرتنی ئەم دەنگانەوە بە گوێ و شیکردنەوە و پاراستنیان لە مێشکدا. ئەوەیان میکانیزمیەت و فیزیۆلۆژی گوێ و مێشک دەگرێتەوە.

زانستی زمان تەنیا-هەر بایەخ دەدا بە لقی یەکەم یانی لە ڕووی دروستکردنەوە.یانی میکانیزمیەتی ئەندامانی ئاخاوتن. دوو لقەکەی دیکە پەیوەندییان زیاتر بە فیزیک و کامپیوتێرەوە هەیە و ئێمەش لەو باسەدا بە کورتی لە چەمکی فۆنێتیک لە ڕوانگەی دروستکردنەوە دەدوێین و ئەوجار لەگەڵ فۆنۆلۆژی بەراوەردیان دەکەین و جیاوازی نێوانیان دەردەخەین.

فۆنێتیک ئەو لقەی زانستی زمانە کە لە کەرەسە هەرە خاوەکانی زمان دەکۆڵیتەوە و شییان دەکاتەوە. کەرەسە خاوەنەکانی زمان (مواد خام) زمان ئەو تاکە دەنگانەن کە بە هێزی ڕەوتی هەوای لە سیەکانەوە هاتوو لە ئەنجامی کۆمەڵە جووڵانەوەیەک کە لە پەردەی دیافڕاگمەوە دەست پێدەکات و سورینچک و گەروو و بەشەکانی زار و کەپۆ بەشداری دەکەن؛ دروست دەکرێن.

**ئەندامانی ئاخاوتن:**

١- لێوەکان

٢- ددانەکان

٣- پووک

٤- ڕەقە مەڵاشوو

٥- نەرمە مەڵاشوو

٦- زمانە چکۆلە

٧- پێشەوەی زمان

٨- نێوەڕاستی زمان

٩- سەری زمان

١٠- دواوەی زمان

١١- گەروو
١٢- ژێیەکانی دەنگ (تارهای صوتی)
فۆنێتیک ڕوونی دەکاتەوە چۆن هەر تاکە دەنگەی زمان دروست دەکرێ.... لە چ بەشێکی زاردا دروست دەبێ. هەڵوێستی ئەندامانی ئاخاوتن لە کاتی دروستکردنیان چۆنە؟ تایبەتی سیما(ڕوخساری) هەر دەنگە چییە و چۆن لە دەنگەکانی دیکە جوێ دەکرێتەوە؟ بۆ وێنە فۆنێتیک بەو جۆرەی ڕوون دەکاتەوە چۆن دەنگی(ک) دروست دەکرێ. نێوەڕاستی زمان بەرز دەبێتەوە و خۆی لە نەرمەمەڵاشوو دەدا. ڕێی بای لە سیەکانەوە هاتوو دەگرێ و تەوژمێک (فشار) دروست دەبێ. لە پڕ زمان دێتەوە خوارێ. دەنگی کاف دروست دەبێ، ئەگەر لە کاتی دروست بوونی ئەو دەنگە ژێیەکان لەرینەوە دەنگەکە دەبێتە (گ). یانی(ک) و (گ) لە هەمان شوێن لە زاردا دروست دەکرێن. ئەوەی ئەو دوو دەنگە هاوشوێنە لێک جودا دەکاتەوە هەڵوێست و دەخالەتی ژێیەکانە. کە لە کاتی دروست کردنی(ک)دا نالەرینەوە و لە (گ)دا دەلەرێتەوە.
بۆ دروست کردنی دەنگی(س) بەشی پێشەوەی زمان نزیک بەشی پێشەوەی مەڵاشوو دەبێتەوە و کەلێنێک پێکدێنێ. بای لە سیەکانەوە هاتوو بەو کەلێنەدا تێدەپەڕێ دەنگی(س) دروست دەبێ. ئەگەر لە کاتی دروست کردنی ئەو دەنگەدا ژێیەکان لەرینەوە دەنگەکە دەبێتە (ز). ئەگەر دوواوەی زمان بەرەو نەرمەمەڵاشوو بەرز کراوە دەنگەکە دەبێتە(ص). (س) و (ز) و (ص) هاوشوێنن. ئەوەی لێکیان جودا دەکاتەوە هەڵوێستی ژێیەکان و زمانە. بۆ دروست کردنی دەنگی(پ) لێوی خوارەوە و سەرەوە دێتە سەریەک (بە یەکەوە دەنووسێن) ڕێی بای لە سیەکانەوە هاتوو دەگرن. تەوژمێک پەیدا دەبێ. لێوی خوارەوە لە پڕ نزم دەبێتەوە (دێتەوە خوارێ) دەنگی(پ)ی لێ پەیدا دەبێ. ئەگەر لە کاتی کوتنی ئەو دەنگە ژێیەکان لەرینەوە دەبێتە (ب) ئەگەر بای لە سیەکانەوە هاتوو لە کەپووە دەرهێنرا دەبێتە (م).
لەو شتانەی وا باسمان کرد وا دەردەکەوێ ئەو دەنگانەی لە شوێنێک لە زاردا دروست دەکرێن هاوشوێنیان پێدەڵێن و هەموو بە لێکدانی لێوی سەرەوە و خوارەوە دروست دەبن؛ پێیان دەکوترێ(لێوی)، یان (شەفەوی bilabial) لە[ف و ڤ]دا کە بۆ دروست بوونیان لێوی خوارەوە خۆی لە ددانەکانی سەرەوە دەدا پێیان دەکوترێ (لێوددانیlabio-dental). لە[ک،گ]دا کە بۆ دروست بوونیان نێوەڕاستی زمان خۆی لە مەڵاشوو دەدا پێیان دەکوترێ (مەڵاشوویی palatal)هەروا بەو جۆرە.

ئەوەی دەنگە هاوشوێنەکان لێک جوێ دەکاتەوە هەڵوێستە manna of articulation ئەو هەڵوێستانەی ناومان هێنان ئەمانە بوون:

١- هەڵوێستی ژێیەکانی دەنگ(تارهای صوتی) لە کاتی دروست کردنی دەنگەکان. (لەرینەوە- نەلەرینەوە).

ئەو دەنگانەی کە لە کاتی دروست کردنیان ژێیەکان دەلەرێنەوە بە (ژێدار Voiced) ناو دەبردرێن وەک[ب، ز،گ، ڤ، د] ئەو دەنگانەی کە لە کاتی دروست کردنیان ژێیەکان نالەرێنەوە وەک [پ، س، ک، ف، ت] بە بێ‌ژێ بە Voiced ناو دەبردرێن.

٢- هەڵوێستی[زار] بەرامبەر کەپۆ-ئەو دەنگانە کە لەکاتی دروست کردنیان ئەگەر بای لە سییەکانەوە هاتوو لە زارەوە دەرچێ بە زاری(Oral) ناو دەبرێن. وەک:[ت، ف، ش، خ...] ئەگەر بایەکە لە لووتەوە دەرچێ بە کەپۆیی (nasal) ناو دەبرێن وەک: (م، ن).

٣- هەڵوێستی دواوەی زمان[بەرزی]بەرامبەر[نزمی]. ئەو دەنگانەی کە لە کاتی دروست کردنیان دواوەی زمان بەرەو نەرمەمەڵاشوو بەرز دەبێتەوە بە قەڵەو (مەڵاشووێنراو palatizad) ناو دەبرێن وەک:[ڵ، ط، ض].

واتا هەر دانە دەنگەی زمان بە دوو لایەن دەستنیشان دەکرێ.

١- شوێنی دروست کردن palace of articulation

٢- هەڵوێستی دروست کردن manner of articulation

ئەم لایەنانە سیماکانی فۆنۆتیکی phonetic features دەنگەکانن. واتا هەر دەنگەی چەند سیمایەکی هەیە. وەک سیماکانی (ب) کە ئەوانەن:

١- لێوی bilabial

٢- ژێدار Voiced

٣- زاری oral

سیماکانی (پ) ئەوانەن:

١- لێوی bilabial

٢- بێ‌ژێ Voicless

٣- زاری oral

سیماکانی(م) ئەوانەن:

١- لێوی bilabial

٢- ژێدار Voiced

٣- کەپۆیی nasal

جیاوازی نێوان ئەو سێ دەنگە هاوشوێنەمان لەو جەدوەلەدا روون کردۆتەوە:

| | لێوی | |
|---|---|---|
| | زاری | کەپۆیی |
| ژێدار | ب | م |
| بێ‌ژێ | پ | - |

سیماکانی(ف) ئەوانەن:

١- لێوددانی labio- dental  ٢- بێ‌ژێ Voicles

سیماکانی|ڤ|ئەوانەن:

١- لێوددانی labio- dental  ٢- ژێدار Voiced

| | لێوددانی |
|---|---|
| ژێدار | ڤ |
| بێ‌ژێ | ف |

دەنگەکانی زمانی کوردی بە گوێرەی ئەو جەدوەلە دەستنیشان کراون.

| | لێوی | لێوددانی | ددانی | پووکی | پووکەمەلاشوویی | نەرمەمەلاشوویی | زمانۆکەیی | گەروویی | ژێکی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تەقیو | پ-ب | | ت-د | | | ک-گ | | | |
| خشەدار | | ف-ڤ | | س-ز | ش-ژ | | خ-غ | ح-ع | ٠ |
| شەکاوە | | | | چ-ج | | | | | |
| کەپۆیی | م | | ن | | | | | | |
| لازمانی | | | | ل-ڵ | | | | | |
| هەژۆک | | | | ر-ڕ | | | | | |
| شێوەبزوین | و (w) | | | | ی (Y) | | | | |

دەنگەکانی زمان لە ڕوویەکی ترەوە دەبنە Consonants و بزوێن Vowels لە ڕووی دروست کردنیان فۆنێتیک بەو جۆرە جودایان دەکاتەوە.
ئەگەر لە کاتی دروست‌کردنی دەنگ دوو بەشی زار ویک‌کەوتن یا بە ئەندازەیەک لێک نزیک بوونەوە خشە دروست بکات ئەوە (کپ)ە ئەگەر ویک نەکەوتن ئەوە (بزوێن)ە.
بۆ وێنە[ ت] دەنگێکی کپە، چونکە لە دروست کردنیدا پێشەوەی زمان وەددانەکانی سەرەوە دەکەوێ. (گ) کپە چونکە نێوەڕاستی زمان وەنەرمەمەلاشوو دەکەوێ. بەلام (ا- ە- ۆ- وو- و- ی- ێ -کورتە بزوێن[i]) هەموو بزوێنن، چونکە لە کاتی دروست کردنیاندا هیچ بەشێکی زار وە هیچ بەشێکی دیکە ناکەوێ و ئەو بایەی لە سیەکانەوە دێ بێ‌تەگەرە و بەرگر بە زاردا تێدەپەڕێ.
دەنگە بزوێنەکانیش بە هۆی چەند سیمایەک لێک جوێ دەکرێنەوە و دەسنیشان دەکرێن.
سیماکانی بزوێنەکان ئەوانەن:
١- هەلویستی زمان چۆنە؟ واتا چ بەشێکی بەرز دەبێتەوە و چ بەشێکی نزم دەبێتەوە. بۆ ئەوە زمان کراوەتە سێ بەش:
الف) پێشەوەی زمان
ب) نێوەڕاستی زمان
ج) دواوەی زمان
٢- هەلویستی لێوەکان خڕن (runded) یا بەش بوونەتەوە.
٣- درێژی و کورتی دەنگەکە.
بۆ نموونە لە دروست کردنی دەنگی[و] دوواوەی زمان بەرەو نەرمەمەلاشوو بەرز دەبێتەوە. لێوەکان شێوەی(خڕ) دەگرنە خۆ. ئەگەر دەنگەکە درێژ کرایەوە دەبێتە[وو].
بۆ دروست کردنی دەنگی[ی] نێوەڕاستی زمان بەرەو نەرمەمەلاشوو بەرز دەبێتەوە لێوەکان لەباری ئاساییدا دەمێننەوە. ئەگەر دەنگەکە کورت کرایەوە دەبێتە[کورتە بزوێن- بزرۆکە].
فۆنێتیک هەر لەو دەنگانە ناکۆلێتەوە کە لە نووسیندا بە پیت دەردەبڕین، کەرەسەی(دەنگی)ی دیکە هەن کە زۆر گرینگن لەزماندا، بەلام لە نووسینی ئاساییدا هیچ نیشانەیەکیان بۆ نییە. وەک:
١- هێز stress وزەیەکی زیاترە (بە گوێرەی بەشەکانی دی) دەخرێتە سەر یەکێک لە بڕگەکانی وشە. بۆ نموونە لە وشەی[ئازاد]دا هێز کەوتۆتە سەر بڕگەی یەکەم. لە وشەی [نوستن]دا هێز دەکەوێتە سەر بڕگەی یەکەم ئەگەر مەبەست ئەوان نوستن بوو. ئەگەر مەبەست (نوستن خۆشە) بوو دەکەوێتە سەر بڕگەی دووهەم.

٢- ئاوازە intonation گۆڕینی ئاوازی ڕستەیە بۆ گەیاندنی مەبەستی جیاواز. هەر ڕستەیەک دەیان مانا دەگەیێنێ بە پێی ئاوازەکەی. وەک لەو ڕستەیەدا:
ئازاد دوێنێ دوو کتێبی چاکی بۆ هێنام.
ڕستەکە بکەرە و وەڵامی ئەو پرسیارانە، [کێ، کەی، چەند، چی، چۆن] دەردەکەوێ بۆ هەر یەکە ئاوازێکی جیاوازە لەوانی دیکە. یان لە ڕستەی: چوو بۆ ماڵی ڕزگار کە بە گۆڕینی ئاوازی ڕستەکە دوو حاڵەتی خەبەری و پرسیاری لێدەردەکەوێ.
ڕستە خەبەرییەکە: چوو بۆ ماڵی ڕزگار.
ڕستە پرسیارییەکە: چوو بۆ ماڵی ڕزگار؟
هەر بۆیە خاڵدانان لە نووسیندا زۆر گرینگە.
٣- تۆن ton ئاوازی بڕگە یا وشەیە. لە هێندێک زماندا بە گۆڕینی ئاوازی بڕگە یا وشە مانای وشەکە دەگۆڕدرێ وەکوو نەرمی و خاوی و گرژی و بەرزی و نزمی لە ئاخاوتندا.
فۆنێتیک لەو کەرەسانە هەموو دەکۆڵێتەوە وەک کەرەسەی زمان بە گشتی.

## چوار کورتە شیعری ئەرسەلان چەلەبی

**ئاوا بوون**

لە وڵاتی تۆ

ئاوارەیی ئاوارە دەبێ

لە چاوی منیشدا

ڕوخساری تۆ

***

**«تامەزرۆیی»**

لە ناوەختێکی تەمەندا

دوور لە خەون و خۆڵەمێش

دامپۆشە بە قژە ئەفسووناوییەکانت و

لە جەنگەی هاریمدا،

ژیرم کە بە سێوەکانت.

***

**«دابڕان»**

لە مانگەشەوێکی جوانا

یەکترمان ناسی

یەکترمان ماچ کرد

یەکترمان دزی

ئەو ڕۆژەی لێک هەڵوەشاین

مانگ قژی بە سەر خۆرەوە نەهێشت.

***

( – )

ئەگەر بێت و لە سوێی تۆدا

ئەو پاییزە

لە خۆی هەڵدا

پەنجەکانم هەڵناوەرێن

«پەروانە ئازمەند»

**شەو درەنگان**

خەیال خۆم لێ دەدزێتەوە
بە شەقامی شارەکەمدا
وێڵ و سەرگەردان
لە دوات دەخولێتەوە
لە دەرکەی تەنیاییت دەدا و
دوو دڵی دوو دڵ
دەرگای لێ بکەیەوە؟!
ئەورۆ شیعرێکی هەتیوم
لە شەقام دۆزییەوە
کەس نەیدەدی
هاتم خۆمی لێ کلاکەم
کە چی دیتم خۆی لە
گلێنەی چاوەکانی مندا سەقامگیر دەکا

**فەریدە کەریمی ئازەر «مەستانە»**

**لێم گەڕێ**

لێم گەڕێ با هەر بە منداڵی بمرم
دڵم، گوڵ بوو گوڵم
چاوەکانت وای لێکرد...
ئێستاش، کەس ناتوانێ بیلاوێنێتەوە
جگە لە چاوەکانی تۆ
خولەمێشی بابردەیی نیگا بووم و
ئێستاش تەپ و مژی هەندەرانی باوەڕەکانم
لێم گەڕێ با هەر بە منداڵی بمرم
ئەو کاتەی کە هەنگاوی چاوەکانم
خۆ شارۆکەی لەگەڵ چاوەکانت دەکرد و
هەزاران زەردەخەنەمان بە یەک توو دەدۆڕان
نەماندەزانی هەنیسکی ماندوو چییە؟
یان گریان و فرمێسک لە کوێرا دێ
لێم گەڕێ گوڵم
گەورەم مەکە...
لێم گەڕێ با هەر بە منداڵی بمرم
دڵم گوڵم
دابەزینی گریانی نەدەزانی
بۆ بەزینی یەک بزە، شین و شەپوری نەدەزانی.
فێرم مەکە گوڵم
لێم گەڕێ با هەر بە منداڵی بمرم.

## شیعرێک لە هادی میهدی‌فەر

### سەیران خۆشە

سەیران خۆشە بەهاران        لە بن سێبەری داران
کۆوە دەبن منداڵان        لە گەورە و وردەساڵان
سەریان پێکەوە ناوە        بە قوژبن و پەناوە
لای ناو دێ سەوزەڵانی        تەپۆڵک زیخەڵانی
بە کایە و گەمە کردن        بە خۆشی و بە سەر بردن
بە دارعەرزی دەکوڵن        تێکەڵ بە خاک و خۆڵن
کوگنای گڵ دائەمێژن        بە کڵۆخشتی دەپێژن
لە چیمەن و لە قوڕە        تێکەڵاوی کچ و کوڕە
بەردان دەکەن بە خانوو        بە تەندوور و بە کوانوو
بە سواری ئەسپی دارین        هەموو ئامادەی یارین
بازەڵێ و پاپارنجێ        دڵیان لە یەک نارەنجێ
کچان بە باجی لوو لوو        ئێخە پڕ مت و مووروو
کۆوە دەبن بۆ شایی        ڕزینە، چۆپی و سێ پایی
گەرما زۆریان بۆ دەێنێ        ئامادەن دەچنە شوێنێ
دێتە سەر ئاوی چۆمەڵ        ژن و کچان بە کۆمەڵ
لەوێ حاجەت دەشۆرن        جەماعەتێکی زۆرن
لە بەینی ژن و کچان        هەڵاتنی بێ‌وچان
منداڵی شلک و ساوا        لە گۆڕی چۆم و دەراوا
بە کایە و پلەزیقان        بە فیزە و فیقە و جیقان
دەڕژێنە ئامێزی چۆم        ویڕای ماسی لە ناو گۆم
لە تەنکاوی بەرکانی        لە ماسیان دەڕوانی
لای دارستانی چۆمەڵ        ڕیزیان بەستۆ بە کۆمەڵ
هەڵ دەخەن لە بەر تاوان        شلپە دەدەن بە ئاوان
ئامادەن بچنە ئاوی        ویڕای قاز و مراوی
هەتا ئێوارە دادێ        خۆر گوم دەبێ لە ناو دێ
ئەمە پیشەی ئەوانە        ئێتر ماندوون شەوانە
دەنوون لە نوێنی شەوا        هەر یەک لە پرخەی خەوا

سەیدیاسین قورەیشی

## چەن خاڵی یاریدەر لە خوێندنەوەی دەقی شیعریدا

نزیک کردنەوەی دەق لە قوتابخانەیەکی فیکری، نەوعێکی ئەدەبی یا سەبک و شێوازێکی تایبەتە، بۆوەی بچێتە ناو خانەی ژانرێکی ئەدەبی یا گەڕان لە ناو خودی دەقدا، بۆ پەیدا کردنی وشەگەلێکی کلیلی وەک مووتیڤێ کە بتوانێ پێوانە و پێوەرەیەک بێ بۆ دەرکی دەق، هەڵبەت ئەگەر خاوەن دەق لەسەر ئەو بڕوایە بێ کە دەقەکەی باری مانایی هەیە.

- لە خۆشمان ئەو پرسیارە بکەین کە دەق بۆ دەچێتە ناو ئەو خانەیەوە و بەڵگەی بۆ بدۆزینەوە.
- ئەگەر دەق، شیعرە بزانین عەرووزییە نوێیە، وەک کام ڕەوتی شیعرییە یا لە نێوان هەر دوو شێواز دایە.
- لە باری زمانییەوە چ تاکتیکێکی بە کار بردووە، تا چ ڕادەیەک ئاڵوگۆڕی لە نەحوی زماندا بەدیهێناوە، زمان ئەدەبییە یا ئاسایی.
- شیعر بە چ وشەیەک دەس پێدەکات؟ خاڵی هاوبەشی هەموو بەندەکان کامەیە؟ لەسەر چ وشەگەلێ جەخت کراوە، هەر بەشەی شیعر دەچێتە ژێر باری مانایی واحید و لەگەڵ مەنتقێکی شاعیرانە دەیخوێنەتەوە؟
- لە شیعردا لە چ جوانکارییەک کەڵک وەرگیراوە؟ شوبهاندن، خوازە، نماد یا... نمادەکان پێش زەمینەی فەرهەنگیان هەیە تاکەکەسین و هەر بۆ خودی شاعیر مانادارن. هەڵبەت شاعیر بۆ خولقاندنی مانای بەرز دەتوانێ یاساکان هەڵوەشێنێتەوە بەڵام بۆ دروست کردنی یاسایەکی زمانی نوێ دەبێ لایەنی دی ئەو گریبەستە یانی بەردەنگیشی لەبەر چاو بێ.
- دەبێ بزانین کە شاعیر لە چ جۆرە مووسیقایەک کەڵکی وەرگرتووە (مووسیقای دەرەکی) ( عەروز ) مووسیقای کەناری (سەروا، ڕەدیف) مووسیقای دەروونی (جیناسەکان، سەروای نێوان میسراع، هاوخانی نێوان پیتەکان)
- زمانی ئەدەبی، خاوەن مووسیقایە و زمانی ئاسایی مووسیقای نییە.
- دیاری کردنی ئەوەی کە لەحنی شیعری حیماسییە، غینایییە یا... و وتە لە زمان کام کەسەوەیە.
- شیعر: لە شیعردا ئیستراتێژییە نە تاکتیک (وەک پەخشان).
- دیاری کردنی کات و شوێن لە شیعردا و هەروەها لێدوان لە وەسفی کاراکتێرەکان و نەوعی فەزای شیعری (شاعیر دەتوانێ بە کەڵک وەرگرتن لە ئێفێکتگەلێک فەزای شیعری دراماتیک بکات).
- لە جوانکارییەکاندا لە چ وێنەگەلێک کەڵک وەرگیراوە و ئەو وێنانەکامیان هەست بزوێنن.

- ڕوونە کە جوانکارییەکان، شیعر جوان دەکات بەڵام شاعیر دەبێ چاو پێداخشان و هەڵوێستێکی فەلسەفیی بۆ مرۆڤ و ژیان و جیهان ببێ و خوێنەر دەبێ ئەوە لە شیعرەکەیدا هەست بکات.
- لە بیرمان نەچێتەوە شکلی کۆمەڵگا لە خولقاندنی ئەوعی ئەدەبیدا کاریگەریی هەیە.
- ئاماژەش بەوە بکەین کە لە ڕوانگەی شاعیرانی شیعری نوێوە شیعر ناسینی ئۆبژەیە، لە ڕێگای هەستی مرۆڤەوە و شیعری نوێ شیعرێکی ئەزموونییە کە دەبێ لە هەموو لایەنەکانەوە نوێ بێ و...

## بەڵێن

دایە ڕووناکی چاوم
خۆت بەڵێنت پێداوم
فێرم کە هەر چی چاکە
ئەوەی خاوێن و پاکە
خۆشم بوێ وەکوو خۆم
بە بێ کەلەک و درۆم
لەوانەی ئەت گێڕاوە
زۆریشم لە بیر ماوە
منیش کاتێ پێ گەیم
لە زۆر شتان تێ گەییم
شیرین بم لەبەر دڵان
خونچە بم لە سەر چڵان
خۆشەویست بم وەکوو تۆ
لە گشت لایە بێ درۆ
ڕۆڵەی زیرەک و زانا
ئەی ئازیزی بە توانا
ئاکارت بێ گەری بێ
شیرین وەکوو تری بێ
زاڵم مەبە زانا بە
مرۆڤێکی دانا بە
هەتا ماوی بخوێنە
بە زیری چاو هەڵێنە

***

## پێشانگای شیلان

شیلان و ڕزگار بە سەرکەوتنەوە قوتابخانەیان تەواو کرد، لە پشووی هاویندا چوونە کلاسی وێنەکێشان و شێوەکاری. شیلان بە بینینی پۆلەکە بزە نیشتە سەر لێوی! دیوارەکان وێنەی جوانیان لە ملدا بوو، دارستان، چیا، گوڵ، کۆتر، کەروێشک سمۆرە...

شیلان حەزی لە کێشانەوەی دیمەنی جوان و ڕەنگین بوو، مامۆستا هەوڵی دەدا، فێری شێوەکاری بکا، دوای ماوەیەک ڕزگار و شیلان چەند وێنەی جوانیان کێشاوە، کردیان بە بەرۆکی دیوارەکەدا شەوانە باسی ئەو کارانەیان دەکرد وا فێری ببوون. شیلان لە هەر دەرفەتێکدا وێنەیەکی دەکێشاوە و دەیکرد بە شانی دیواری ژوورەکەدا، ڕزگار ڕۆژانی هەینی چەکمەی لە پێ دەکرد و دەچوو لە کۆڵان مرۆ بەفرینەی دروست دەکرد، ڕۆژێک دایکی گوتی: ڕزگار گیان وەرەوە ژووری سەرمات دەبێ، تۆش وەکوو شیلان وێنە بکێشەوە.

ئەوە شیلان ژوورەکەی کردۆتە پێشانگا! . . ڕزگار، لە وڵامدا گوتی: دایە من حەزم لە پەیکەرسازییە لە ڕۆژێکی خۆشدا هاوڕێکانی شیلان هاتن بۆ سەردانی پێشانگاکە، منداڵەکان بە بینینی وێنەکان خۆشحاڵ بوون چەکمەکانی ڕزگار خەریک بوو پڕ دەبوون لە ئاو! مرۆ بەفرینە تووا بووە!

***

سەید یاسین قورەیشی

**ئاوڕدانەوەیەک لە ژیاننامەی مامۆستا نووری**

**«کۆچی نوور»**

«لە پرسەی هەر شاعیرێک هەزاران شیعر لە دایک دەبێ»

هەموو دەوری ژیانی من شەوێک بوو

شـەوێکی پڕ لـە مۆتە و دیمەنی دێو!

ئەوەی دیتم بە هاڵۆزی خەوێک بـوو

تراوکێک بوو خۆی و نەتکایە سەر لێو!

مامۆستا محەمەدی نـووری«عەتـری گلۆڵـانی» یادگـاری دەروەی سـەروەری؛ بـێ گومـان لـە ئەنگوست ژومێری شاعیران و ئەدیبانێکە کە وەک ئەستێرەیەکی تیشکاوێژ لە ئاسمانی شیعر و ئەدەبی کوردیدا درەوشاون و ڕێگە و ڕێبازی چینی داهاتوویان ڕووناک کردۆتەوە. مامۆستا هەر چەند قوتابیی قوتابخانە و مەکتەبی ئەو سەردەمەیە، بەڵام چ لە بابەت سەبک و شێوازی شیعری و چ لەبارەی چلۆنایەتی ژیانی پڕ لە ژانێوە خاوەنی دەنگێکی جیاواز و سەربەخۆ بووە. مامۆستا پاش خوێندنی قورئانی پیرۆز، کتێبەکانی سەرەتایی ئەو کات وەک: «سمایل نامە» و «ئاگەهان»، و «گوڵزار» و لە دواییدا «گوڵستان و بووستان» و دواتریش «تەسریفی‌زەنجانی» لە نەحودا، لای بابی خوێندووە و لە ساڵەکانی ۱۳۱۲ و ۱۳۱۳دا مێژووی «موعجەم» و «دوڕڕەی نادری» و هێندێک لە کتێبە سەرەتایی‌یەکانی «سەرف و نەحو»ی هەر لای بابی خوێندووە.

بابی مامۆستا کە هەستی نـەتەوەخوازی و نیشتمانپەروەری بـووە و لـەگـەڵ دەستەیـەک لـە نووسەران و ڕووناکبیرانی کوردی ئەودیو لە پێوەندیدا بووە، لە وەرزی پاییزی ساڵی ۱۳۱٤ لـە تەمەنی ٦۳ ساڵیدا کۆچی کردووە و ئەو و پێنج منداڵی دیکەی لە دوای خۆی بەجێ‌هێشتووە. مامۆستا بە پێشنیاری خدراغای عـەزیـزی ئاغـای گلۆڵـان بـەجێـی بـابی دەبێتـە مـیرزای ئـەو و مامۆستای منداڵەکانی. خدر ئاغا لە ساڵی ۱۳۲۱ نەخۆش دەکەوێ و دەچێ بۆ مەهاباد بۆ لای دوکتور و ئەویش لەگەڵ خۆی دەبات. لە مەهاباد لەگەڵ ئاغای کەیانی ئاشنا دەبێ و بـە هـۆی ئاغای کەیانی لە باغی سیسە لەگەڵ دەستەیەک لە ڕووناکبیرانی نیشتمانپەروەر چاوپێکـەوتـنی دەبێ و لەو کاتەوە لەگەڵ وان پەیمان دەبەستن و ئەوە دەبێتە هۆی ئـەوەی مامۆستا دەسـت بـە کاروباری سیاسی بکـا. پاشـان مامۆسـتا لـە بـەهـاری سالـێ ۱۳۲۲ مالـی بـار دەکـا بـۆ گـۆلی مەرزینگ لە لای برایماغای قارەمانی بە میرزایەتی و مامۆستایی منداڵەکانی دادەمەزرێت.

پاش کۆچ و کۆچبارێکی دی لە گوندی «گوڵێ» بۆ «شێخاڵی» مامۆستا لەگەڵ کاک خالیدی حیسامی«هێدی» ئێستا و «شێواو»ی ئەوکات یەکتریان ناسی و گڕوگاڵی شیعر و هۆنەراوەیان دەس پێکرد.
لە ساڵی ١٣٢٤ مامۆستا لەگەڵ پێشەوای مەزن دیدار دەکات و هەروا هەلی دیدار لەگەڵ «حاجی بابەشێخ» و «حەمەحوسێن‌خانی سەیفی‌قازی»ش هەڵدەکەوێ و لە سەردەمی کۆماری مەهاباددا بەشداری لەو بزووتنەوەیەدا دەکا و لەگەڵ مامۆستایان هەژار و هێمن بە هۆنینەوەی شیعر هەستی نیشتمانپەروەری خەڵک دەوروژێنن. پاش تێکچوونی کۆمار مامۆستا نووری زۆر پەرۆش دەبێ و هەستی خەم و پەژارەی خۆی لە شیعری بە ناوبانگی «لەسەر بستووی ژیان وەک داری چاکی بە تەنیا مامەوە بێ بار و بێ بەر» دەردەبڕێ. مامۆستا پاشانیش لە هێندێک بزووتنەوەی سیاسی و کاروباری کۆمەڵایەتی بەشداری دەکا. ساڵانی پاشماوەی ژیانی مامۆستا بە لەش بە باری لە خەڵوەت و گۆشەگیری و ڕابواردن لەگەڵ کتێبەکانیدا کە خۆشەویسترین سەرمایەی ژیانی بوون تێدەپەڕێ.
نووری هاوچاخ و هاوتەمەنی «هێمن» و «هەژار» و «هێدی» و «ئاوات» بوو. ئەو یەکێکە لە دوایین ڕێبوارانی شێوە و ڕێبازی شیعری موکریان، لەم ٦٠ ساڵەی دواییەدا.
مامۆستا بەشێک لە شیعرەکانی لە وەڵامی شاعیرانی هاوچەرخ و هاوبیری خۆیدا نووسیوەتەوە و شیعری نیشتمانپەروەری و عیشق و دڵداری و جوانی ناسک‌خەیاڵیشی زۆرە.
مامۆستا شیعرەکانی لەوپەڕی کورت بێژی و جوانکاری و ناسک‌خەیاڵی دایە. مامۆستا لەگەڵ گۆڤاری سروە هاوکاری بووە و بەشێک لە ژیاننامە و شیعرەکانی بە تێکۆشانی کاک سەلاحی ئاشتی لە لایەن بنکەی ژین لە سولەیمانی چاپ کراون. مامۆستا لە ڕێکەوتی ١٣٨٧/١١/٢ لە شاری بۆکان کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی لە حاڵێکا جەماوەرێکی زۆری خەڵکی شاری بۆکان و ناوچە و شارەکانی دەوروبەر لەگەڵ بوو لە گۆڕستانی دێی گردی قەبران ناشترا. خوا بە بەهەشتی خۆی شاد کا و ڕێگەی درێژەی هەبێ.

## غەزەل

قـوبیـەیـی سـەر دونـدی بـەرزی هـەسـتی ئینسـانە غـەزەل،
کووچـە بـاغی سـەوزی بـیری شـاری مـەسـتانە غـەزەل،
بـۆ بـەیـانی مـافی هـۆز و دەربـڕینی دەردە کـورد،
مـەڵـهەمـی ناسـۆری زامـی دەردی کوردانـە غـەزەل،
کـانی گـەنجی مرخی شـەنگە، پڕ لـە پەنـدە و فـەلسـەفـە،
کـەشـتی ئـەفکـاری مـەنـدی گـۆلی عیرفانـە غـەزەل،
کـاتی مـاتی و ڕەنجـەڕۆیـی و لانـەوازی هـۆش و لـەش،
جـەوهـەری ئێکسـیری ڕۆحـە، داو و دەرمانـە غـەزەل،
دوای ڕەویـنی هـەوری تونـد و هـەڵـمی بارشـتی خـەیـاڵ،
کۆلکـەزێڕینـەی هـەتـاوی پاشـە بارانـە غـەزەل
باڵـەخانـەی شانشـینی مێـری شـازی ویـژەیـە،
سـەرگوڵـی بـەسـتە و مـەقـام و شـاهی دیوانـە غـەزەل.
بـەردەنووسـی سـنگی خـەڵـکە، ڕەنگـی فـەوتـانی نیـە،
کۆنـەشـی مـزر و فـەریکـە، ڕەمـزی هـەرمانـە غـەزەل.
بـۆ پیاسـەی هـەسـتی تاسـە و سـۆزی دەمسـازی ئـەویـن،
خـەڵـوەت و زەنـویر و کـەسـکە، چـەشـنی جێژوانـە غـەزەل.
سـەمفـۆنی ویـژە و خـەیاڵـە، نـۆتی میلـۆدی بـەیـان،
سـازی دەمسـازی ئـەوینـە، بـاغی مـەسـتانە غـەزەل.
ڕێتـویتی ڕیـی مرۆڤـە بـۆ ترۆپـەی بـەرزی ژیـن،
دوژمـنی پـەسـتی و دەهۆیـە، دژ بـە ویسـتانە غـەزەل.
بـەرهـەمـی بـۆ چـوونی وردی، حـەزرەتی نالـی و ئـەدەب،
ئالوویالـووی شـارەزوور و شـاری بۆکانـە غـەزەل.
بـۆ وەڵـامی زوڵـم و زۆر و کێشـەجـاری ناحـەزان،
نـەسلـەحـەی ینـدەنگـی دەسـتی مامـە سـۆرانە غـەزەل

**چوار چرکە چیرۆک: نووسینی ئازاد عەزیزی**

١- من لەیلام، بە وتەی زۆر کەس جوانترین کچی ئاواییم. دەی ئەگەر ئاوایە بۆ تەنانەت نەتوانم ماتیکێک بە لێومدا بێنم، پێرێ چیمەنی هاواڵم لەگەڵ دایکی چوون بۆ شار و منیش ئەوەی پارەم هەبوو پێم دا تا لە شار ماتیکێکم بۆ بکڕێ. بەڵام ئێستە ناوێرم لە لێومی دەم (لە ناکاو باوکی دێتە ژووری). ماتیکەکە فڕێ دەداتە قولێنچکێکی ژوورەکە ئەو چاوە زەقانەی باوکی ئاگای نەکرد.

- دا بچۆ ئەو...م بۆ بێنە. لەیلا دەخوشێتە دەرێ دەچێ شەمچەکە بێنێ.

- داوای شەمچەی نەکرد. جەگەرە، نانا جەگەرە نەبوو، چەخماخ نانا تەسبیحەکە، نانا ئەویش نەبوو، پشتوێنەکە... نانا...

ئەرێ توخوا خوێنەری ئازیز... ئاخری چی بەرم بۆ سەر قەبرەکەی.

٢- حاڵی بووی؟!... ئەرێ دەمێک دەبێ بە دەستووری یاسا لە شاری ئێمە «هەموو دەبێ حاڵی بن» هەر جار بە گرژی پرسیاریان لێکردی: حاڵی بووی؟!...

دەستبەجێ دەبێ بڵێی ئەرێ: ئەگەر بڵێی نا، تووشی هەزار بەڵا و سەرئێشە دەبی کە واتە تیرباران و ئیعدامیش.

حاڵی بووووی؟! ئەرێ... ئەرێ... ئەرێ

هەتیو! زمان نەترازێنی بڵێی لەم چیرۆکە هیچ حاڵی...

٣- خۆشەویستی

دوگمەشکاو، هەڵووچە، حەب، تیغ و تەنانەت جارێکیش دەرزی قژم تێدا دیتەوە. بەڵام تا ئێستا بەمجورەم ڕێک و خاوەن فۆرم نەدیبوو: ئاخۆ، خاوەنەکەی چ شێرەکوڕ و باڵابەرزی بێت.

«بۆنێکی قووڵی لێ‌هەڵدەمژێت و بڕیار بە خۆی دەدات خاوەنەکەی بدۆزێتەوە».

بە بزەیەکەوە «خانم دوکتۆر» گووەکە دەخاتە ژێر دەزگا بۆ ئەزموونی نەخۆشی.

٤- دەست

زۆرجار ژیانی ئێمە تەواو پێوەندی دەستەکانمانەوەیە؛ بە قەڵەمەکانمان، بە مستەکانمان هەر بۆیەش من لەجیاتی گەردەنبەند و ماتیک دەستێکی خۆمم دا بە تۆ بە یادگاری.

مریم یەتیمی (سۆز)

**ژێر باڵ**

لە ژێر باڵی چاوەکانییەوە
خۆڵەمێشی خۆڵە ساردەکانم ئەبارێ و
بە چەپکە گوڵی حەزەوە
بەرەوپیری بووکی هەزار زاوایی
ئەبردم
بەفری شادیم لێ باران
باران گریا بۆ ژانی گوڵ
سوورە مۆمی هەزار خۆزیا،
ڕێگای ئەستەمی ئەبڕی
دەنگ تا ڕەنگ
قیژەی شیعرێکی سەر براو
ژوانێکی شان قوڕاوی تریفەی چەند گەڵایەکی هەڵوەری و
خەمێکی ئاشنا.
وەک تاسەباری ئاوێنە و مانگ و دیوار دوو هەستی جیاواز
پەنجەی پڕ زامی سوورە سوارێکی مانگ
لە سنگی مەڕمەڕی قەڕنا شەپۆلی دا
کف لە دیوار
هەورێک بە خورپەی ئامێزی خاکەوە
دابەشم کەن
جۆگەی فرمێسک تا تەختەجاری دەم وشکی ئەدووی ئەسێ
سوورە مۆمێک تا قیژەی شیعرێکی بێدەنگ
سوورە سوارێکی کڕکەڵانی بێ گەڵا
بە سەرپۆشی سوورەوە ماچ و برین
باریکە ڕێی ژوانم بێ لە تەمە
دەریا خامۆش
ماسی سەرخۆش

چیا بە پرچە سپییە بەفرینەکەیدا
گوڵی هەسارە لە دەرزیلە گرشە و
ئەشکەوت لە ئەوتراوەکانیا
چلاوچل فریوی دەنگم ئەدەن
لە لاسوور فانووسێکەوە هەواڵی لووتکە
تەراوەنی هەناسەی سروەیەکی قژ تەڕ
گونا پەنجەرەی خەیاڵاوی شەو
ئاخ و مانگ و کچ
هەنگاو و بێ گرێکی کۆترێکی عەشق بەجێماو
کوڕی مانگ، سوورە سواری کرکەڵانی بە بەرچاوما تا
ئەو دوور دوورانە
ماچێکی کاغەزی و زامێکی سەر براو
کۆتر کۆتر بە نێو چاوی ئاسمانا لکا
ژنێک بە کۆڵانی شیعرا ئەڕۆیی و
بە گۆرانی، ئەم سێوە
ماچ و برین شەرمن ترێک سپی هەڵگەڕاوە
سوورە سوارێکی هێلی زیوینی بەیان بلێسەیەکی هەڵپەو
جریوە مەل لەغاو ئەکەن
تاشەی شاباڵێکی سوور
لرفەی ئاورێکی باڵا بەرز
پەنجەرەیەک ڕوو بە شەو
ئاهەنگێکی کۆیلەتی لە زەنگۆڵەی کام لانکەوە هەڵئەبێ
باخچە زەردی تێلە دڕکاوییەکانە و
ئەمشەو شانم لەسەر شەپۆلی دەریا داداوە
پەنگە شەپۆلەکان دەستەمۆ کەن
ئەو وشانەی باڵی بیریان کردم
بەرێی
ئەو زامانەی لە شاپەڕی ئاوێنەوە

تیشکێ لە شاپەڕی ئاوێنەوە
باوەش باوەش
لەسەر فەرشی دیوەخانێک شەپۆل ئەدەن
شانە لەسەر شەپۆلی دەریا داداوە
لە لاسیقەکۆنی ئازادییەوە
لە بۆقی هەناسەی پیرە شەختەی ئامال

## هەواڵێکی ئەدەبی

ئێوارەی ڕۆژی پێنجشەممە ڕێکەوتی ١٣٨٧/١٢/١ بەرامبەر ١٩ ژانوییەی ٢٠٠٨ کاک ماجید ڕووحانی کەسایەتی ئەدەبی و فەرهەنگنووس و زمانەوانی بە ناوبانگ سەردانی کۆڕی فێرکاری و فەرهەنگیی ئەدەب(ی) بۆکانیان کرد. ئامانج لەم سەردانە داوای یارمەتی کردن و هاوکاریی ئەندامانی ئەم کورە بۆ نووسینی فەرهەنگێکی کوردی فارسی ١٢ بەرگی، بوو. هەر بەو بۆنەوە لێداوانێکی زۆر لەو بارەوە ئەنجام درا و بەڵێنی یارمەتی و هاوکاری لە لایەن ئەندامانی کۆڕ بە بەرێزیان درا. ئەندامانی بەشدار لەم کۆڕەدا بریتی بوون لە: کاک مستەفا ئیلخانی‌زادە بەرپرسی کۆڕی فێرکاری و فەرهەنگیی ئەدەب، کاک سەیدیاسینی قورەیشی کارگێری کۆڕ، کاریکاتوریست سەیدحەمەدەمین قورەیشی، کاک حەمەدەمینی شاسەنەم، کاک خالید ئەحمەدی، کاک کاوە عەزیزنەژاد، کاک محەممەد نوورمحەممەدی کە هەموویان مامۆستای سانەوی(دەبیر) و نووسەرن، هەروەها کاک شۆڕشی خالیدی، کاک ئەمین گەردیگلانی، کاک سەلاح نیساری، کاک ئیرەج ناهید، کاک ناسر عەلیار، کاک سەلیم ئاروەم، کاک مەتووچیهر جیهانی، کاک ڕزگار نووری لە نووسەران و هونەرمەندانی شاری بۆکان. لە کۆتاییدا بڕیار درا لە داهاتووشدا ئەم کۆبوونەوانە ئەنجام بدرێ و پێوەندی بەردەوام تا کۆتایی ئەم پرۆژەیە هەبێ.

## ئاوات و خاسەکەو

چاوی شاعیر کە شێتانە و جوان دەڕوانێ
لە ئاسمانەوە تا زەوی دەبینێ،
لە زەوییەوە تا ئاسمان.
لەویدا خەیاڵ بەرجەستە دەبێ،
هەموو ئەو شتانەی کە نادیار و بێ‌شێوەن
پێنووسی شاعیرە کە ڕۆحیان پێدەبەخشێ
بۆ خەیاڵێک کە نییە
ماڵ و ناونیشانی دەداتێ.
(شکسپێر)

بێ‌گومان هەر خوێندنەوەیەک پرسیارێک بۆ خوێنەر دروست دەکا. بۆچی شاعیر شیعر دەنووسێ؟ بۆ زمانی شیعر لە زمانی قسە کردنی ڕۆژانە جیاوازە؟ شیعر چییە کە وا زمانەکەی ڕەوان و سووک و لەگەڵ دڵ ئاشنایە؟ هۆی چییە عاشقان و دڵ بە خەمانی ڕۆژگار ڕوو دەکەنە شیعر؟ شاعیری بلیمەت بەر لەوەی سەر و پیرۆزە؛ گرنگ نییە سەر بە چ میللەت و وڵاتێکە، گرنگ ئەوەیە کە ڕۆڵەیەکی ڕاستەقینەی سەر ئەو زەمینەیە. هەر لەم ڕوانگەوە دەکرێ بڵێین شاعیر خەڵکی هەموو وڵاتێکە. لە هەر شوێنێ عاشقانی شیعرەکەی زۆر بن، کوڕی ئەو وڵاتەیە. شاعیران لە خەڵکی ئاسایی قووڵتر هەست بە دەورووبەری خۆیان دەکەن. هەر بۆیەش خۆیان ماندوو دەکەن، هەوڵ دەدەن بە شێوەیەکی ڕاستەقینە هەست و نەستی خۆیان دەربڕن. بۆیە دەڵێن یەکەم دەنگی شاعیرە لەگەڵ خوێنەر دەدوێ.

مامۆستا ڕاوچی دەبێژێ: شیعر بۆ شاعیر وەکوو فێ وایە تا نەیگرێ لە چنگ ئێش و ئازاری دەروون ڕزگار نابێ و کورپەی هەستی دڵی ئارام ناگرێ.

هەستی دڵ و دەنگی مەل و سۆزی نیشتمان و بزەی بەهار لە شیعری "ئاوات"دا بە چەشنێ تێکەڵاوە کە نووسەر و خوێنەری بە توانا نەبێ ناتوانێ لەسەر دەریای بیری لەنگەر بگرێ و چاو لە شەپۆلی پڕ هەستی بە سۆزی بکا.

بــــه تـــــەنیا گیانەکـــــەم ســـــوزی دڵـــــم پەروانـــــە دەبزانــــێ
خـــــەمی دڵ بولبـــــولێکی بــــێ گـــــوڵ و بـــــێ لانـــــە دەبزانــــێ
ئیمــــامی نـــــاوی گـــــەورە و شـــــاری وێرانـــــە کـــــە تێفکـــــرێ
لــــــە مـــــەعنای شـــــیعرەکانم هـــــەر دڵــــــی وێرانـــــە دەبزانــــێ(ل ٨٤)

پەروانە و لانە و وێرانە کە هەر سێکیان هەڵگری چەن رازی نهێنین، دەبێت بە وردی راڤە بکرێت. پەروانە نیشانەی مرۆی ئەوینداری پاکە بۆ دڵی ناتوانێ درۆ لەگەڵ گراوەکەی بکا. تا ئەو جێگایەی گیانی خۆی بەخت دەکا. لانە خاک و ماڵ و ژیانی مرۆڤ پێکەوە تێکەڵاو دەکا. مرۆڤ گیانی شیرینی بۆ ژیان دەبەخشێ، ژیانی لەسەر خاک دەبەخشێ. وێرانە دڵی شاعیرە بە چی ئاوەدان دەبێتەوە؟ بە هەستی پاکی مرۆڤی دەوروبەر کە چرای زانست لە تاریکەشەودا رۆشن کەن. شیعری باش ناتوانی بە تەنیا جارێک خوێندنەوە تێی‌بگەی، راڤەی بکەی، هەڵیسەنگێنی و مەزەندەی بۆ دیاری کەی. هەر وەکوو چۆن کە سەمفۆنی بتهۆڤێن ناکرێ بە تەنیا جارێک تێی‌بگەی.

ئاوات بە جوانی و وردبینی، ئاگاداری ژیانی خەڵک بووە، ئەو سەردەمەی ئاواتی تیا ژیاوە زمانی کوردی تەواو یاساغ کرابوو، نووسینی کوردی کارێکی زۆر سەخت و ئەستەم بوو، هاواڵانی ئاوات، ماموستا هێمن و هەژار لە تاراوگەدا دەژیان. ئاوات بە تەنیا لە گوندێکی دوورەدەست ژیانی بە سەر دەبرد، بۆ ئەوەی سەر بۆ کاربەدەستانی رژێمی شا نەوی نەکا و بە سەربەرزی بژی. بەڵام پەپوولەی رۆحی هەمیشە بە شەمی دڵی خەڵکی هەژار دەسووتا.

ئاوات لە شیعرەکانیدا وشەی شاری زۆر بە کار هێناوە. شار لە شیعرەکانی ئاواتدا نیشانەی پێشکەوتن، ئاڵوگۆری ژیانی تازەی مرۆڤی سەردەم بوو. ئەو جیهانەی کە دەبێ شاعیر تیایدا بژی، مەرج نییە کە شیعر ئامێز بێ. ئەو جیهانە هەر جیهانێک بێ وا بە ئاسانی نایەتە بەر دەستی شاعیر. بەڵکوو هەمیشە سرکە و خۆی نادا بە دەستەوە. تەنیا لە رێی ئاوا کردن و سەر لە نوێ دارشتنەوە و پشکنینە، ئەو جیهانە کە خۆی نادا بە دەستەوە ماڵی دەبێ و دەکرێ وای لێ بێ بیگۆڕی بە بابەتێکی رۆحی شیعر. کە واتە جێی بە سۆی بوو. داخی گرانتر لەوەشی لەو سەردەمەدا زمانی کوردی یاساغە و نووسینی کوردی لە ژەهری مار تاڵتر بوو. رووناکبیران و نووسەرانی خاوەن هەست یان لە بەندیخانەدا دەسبەسەر دەکران یان لە تاراوگە دەژیان. ئاوات ناتوانێ ئەو رووداوە گرینگە ئاشکرا نەکا، بۆیە دەبینین بە شێوەیەکی جوان ئەو رووداوە بە «راوە کەو» دەشوبهێنێ و دەڵێ:

خاسەکەیَ لەو کەژە هەلنیشتووە

خالی ڕەش و سووری بە جووت ڕشتووە

ڕاوچی هەموو لەو کەوە دەرکەوتووە

بۆ چی؟ دزە؟ جەردەیە؟ چی کردووە

مال و مەڕ و زیوەری کێی بردووە

کێهە کەسی ئەو لە ژیان کردووە

باعیسی قەتلی چییە بیستوویەتی

ژینی بە سەربەستییە ویستوویەتی

چاکە کە داودزە شوکور خاسەکەو

دیوییە، وریایە بە ڕوژ و بە شەو

بەڵێ هیچ کەسێک نییە بتوانێ شاعیرانە ڕەسمی جیهانێکت بۆ بگرێ گەر خۆی تا ڕادەیەک بە لانی کەمەوە هەندێ جار تیایاندا نەژیابێ، ناشتوانێ وەسفی حالەتێک بکا گەر خۆی نەبوو بێ.

ئاوات ئەگەر بەندیخانە و ئەشکەنجەی نەدیتبایە باوەڕم وایە شیعری خاسەکەو لە دایک نەدەبوو.

ئاوات زۆر هیوای بە ڕۆشنبیرانی لاو هەیە، هەمیشە لاوانی هان داوە بۆ خوێندن. جوان تێگەیوە هەتوانی زامی ئێمە بە خوێندن سارێژ دەبێتەوە. ویستوویەتی دڵ و ڕۆحی بە تیشکی زانین پاراو بکا. تەمامی هەستیان چڕ بکا، خەزانی نەزانی ڕابردوو لە بیر کەن و ڕێگای ڕاستی مرۆڤدۆستی بگرن و چاوەڕوانیی لە گەنجان هەیە بۆ دواڕۆژ چرا بن بۆ تاریکی و نەزانی. زۆر وردبینانە و ژیرانە بە ئاگا لە ژێر پەردەی شیعردا دەیدرکێنێ و دەڵێ:

با بێتە بەرهەم کورپەی نەتەوە

هیوای دواڕۆژی نەتەوە بەوە

بۆ نیشتمان و بۆ گەل دەکۆشێ

لە ڕێی وان هەرچەند زووخاو دەنۆشێ

ئەوسا ئاواتی «ئاوات» دێتە جێ

شین دەبێ خەڵفی هیوای جێ بەجێ(ل١٨١)

ئەو سەردەمەی قاقڕ و ویشکەساڵی تووشی شیعر بوو، هەندێ کەس بە نێوی مۆدیلی ڕۆژەوە ئاداریان بە سەر پادارەوە نەهێشتبوو. یەکێک لە خووەکانی ئەو کەسانە کە ناتوانن هەستی خۆیان دەربڕن ئەوەیە خۆیان لە ژێر وشە و ڕستەیەکی زۆر درێژ دەشارنەوە کە دواجار دەکەونە دوای مۆدەی بازاڕگەرمی ڕۆژ. ئاوات ئەوەی بە نەخۆشی ئەدەب زانیوە، بەڵام پەیامی ڕاستەقینەی شاعیر پەیامێکی ئاسایی نییە، شاعیریش وەک زانایەک وایە. هەر زانایەک کە دەڕوانێتە برووسک و چیا و ئەستێرەکان، قەت خۆی بە گەورە نازانێ. شاعیریش هەروا بۆ هەر کردەوەوکارێک هیچ شتێکی لەبەر چاو نییە، نزم و بەرز و گەورە و بچووک. تەنیا مانا و بەهاکان ڕوانگەیان بۆ شتەکان پێدەگۆڕێ.

ئاوات چۆنیەتی کارەکانی و سووتانی و خەونەکانی لەو شیعرەدا بۆ خوێنەر دەردەخا و وەک وەرزێڕێکی لێزان و بە ئەزموون جۆمالی جۆگەی شیعری کردووە و وشەی خۆماڵی بەکار هێناوە و لە وشەی نامۆ و بێگانە خۆی پاراستووە. بەڵام ئەو کارەی زۆر بە ئاوەڕۆکێکی جوان ئەنجام داوە و زۆر شتی نهێنی لە قالبی شیعردا نووسیوە و ئەسپی خەیاڵی لە گۆڕەپانی شیعردا تاو داوە. ئەو بۆ ئاسۆیەکی دوور دەیڕوانی و زۆر بۆ بەهاری شادی گەشبین بوو.

دەڵـــــێن جـــــەژنی ســـــەری ســـــاڵ
پـــــیرۆز بـــــێ لـــــە کیـــــژ و کـــــاڵ
کـــــەس نـــــەمێنێ پـــــیر و لاو
چ مـــــێ، چ نێـــــر، ژن و پیـــــاو
دەســـــت بگـــــرن ڕۆژی هاتـــــە
وەدی هـــــات ئـــــەو ئاواتـــــە(ل١٤٨)

کۆتری سپی خەونەکانی باڵ دەگرن بۆ ئاسمانی ساماڵی ئەوین دەفڕن. ئاوات ئامانجی خۆشی و یەکبوونە. دڵی بە کوڵی لە بۆتەی ئەویندا قاڵ بووە، بە جەشنێ شیعری سرۆشت و بەرگریی تێکەڵ کردووە. ئەگەر کەسێک لە وڵاتێکی دیکەدا ژیابێ و کوردستانی هەر نەدیبێ، ئەگەر چاو لە دیوانی ئاوات بکا، بۆی ڕوون دەبێتەوە سروشتی کوردستان چۆنە، باری سیاسی سەردەمی ڕژیمی شا چۆن زوڵم لە کورد کراوە، بۆن و بەرامەی شیعری ئاوات لە سروشتی بەهاردا نیشانەی ڕزگار بوونە. لە وەسفی بەهاردا مامۆستا هەژار دەفەرمێ: بە بیروڕای من هیچ بوێژێکی کورد وەکی کاک کامیل ناتوانێ بەهاری کوردەواری وێنە بگرێ.

«ئاوات» ئامانجی ئەوە بووە ڕۆژێک بێت مرۆڤ وەک بەهار بەرگی تازە لەبەرکا جیهان برازێنێتەوە، کەس حەقی کەس لە ژێر پێ نەنێ، هەموو وەک یەک بژین، بە شادی ئاسمان بێن بە دایک و زەوی بە سێبەر و خۆریش بە چرا بێت بۆ تاریکی ژین.

بەهار هێنەری مـوژدەی خەباتە
لابەری مەینەت، هێنەری هاتە
ئاوریی نەورۆز پرشنگی ژینە
بۆ گەل و بۆ هوز گری بە تینە(١٧٩)

ئەو بەهارەی ئاوات دەیهەوێ و جەژنی بۆ دەگرێ و ئاگری نەورۆزی بە نیشانەی ڕووناکی دژی تاریکی دەزانێ. خۆزگە ئێوەش بەهاری کوردستانتان بە چاوی شاعیر دەبینی بە زمانی شاعیر ئاهەنگی نەورۆزتان دەچڕی بۆ بەهار.

شیعری شاعیر نیشانەی ڕاستیە. دەیکاتە سەرمەشقی ڕێگای بۆ ژینی جیهانی خۆی و سەر لە نوێ دایدەڕێژێ. بەڵام ئەوەی دەبێتە نووسینی ئەدەبی و جیهانی ئەدەب، هەمیشە شتێکی ترە و واقیعێکی تری لێ دەکەوێتەوە. واقعی‌ترین جیهانی شیعر ئەوەیە کە شاعیر ناتوانێت لە سروشتی خۆی و دەوروبەری دوور بکەوێتەوە، لەگەڵیا دەژی ئەو شتانەی کە زۆر بە تام و چێژن یا زۆر بە بەها و نرخن، گەلێ زەحمەتە پێناسە بکرێن، جیهانی شیعری ئاوات هەمیشە بەهارێکی سەوز و ڕازاوەیە لە ناخی دڵەوە تێیدا ژیاوە.

١ـ ئەوین لە شیعری ئاواتدا ژیلەمۆی دانەمرکاوی سکڵی نەورۆزە.

٢ـ نیشتمان لە شیعری ئاواتدا خوێنی مرۆڤە نیشانەی سوور بوونی مرۆڤە بۆ ژیان.

٣ـ مەل لە شیعری ئاواتدا ساز و مۆسیقای ڕۆحی مرۆڤی ئاشقە بۆ ڕۆحی شەیدا

٤ـ دڵ لە شیعری ئاواتدا سەوزەی بەهاری کوردستان، کانی کوێستانە بێ ماندوو بوون ڕێبواری ڕێگای دەریای یەکبوونی مرۆڤ دەبڕێ.

دیوانی ئاوات لەو چوارانە سەرچاوە دەگرێ و دەستی یەک دەگرن بەرەو دەریای شیعری خۆشەویستی و مرۆڤی ئەویندار.

سەرچاوەکان:


١ـ ئەحمەد شاملو، (از زخم قلب آمان جان)، ع پاشایی

٢ـ لە ستایشی ئەدەبدا، شێرزاد حەسەن، چاپی ئاراس – هەولێر

٣ـ دیوانی ئاوات، کۆکردنەوەی نەجمەددین ئەنیسی، چاپی یەکەم.

## ئافرەتێکی نەخوێندەواری بەهرەمەند

خوشکە ئامینەی چاک یەکێک لەو خوشکە زەحمەتکێشانەیە بە هۆی نەداری و نەبوونی و هەلومەرجی نالەبار نەیتوانیوە بخوێنێ و فێری خوێندەواری بێ. بەو حالەشەوە ئەو خوشکە عەلاقەیەکی زۆری بە شیعر و ئەدەب هەیە و جگە لەوە زۆر مەقام و گۆرانی و بەیت و باو قسەی ئەستەق دەزانێ و لە سینگیدا پاراستوونی، بۆخۆشی شیعر دەڵێ و یەکێک لە ئەندامانی کۆڕی فێرکاری و فەرهەنگیی «ئەدەب»ە و بێ‌وچان لە بەرنامەکان و بۆنەکانی ئەم ناوەندە بەشداری دەکا. لێرەدا بۆ وێنە پارچە شیعرێکی منداڵانەی ئەم خوشکە بەڕێزە دێنینەوە:

پێشکەشە بە نەوەکانم: کانی و کامیار.

### بۆ منداڵی کورد

ئەمن منداڵی کوردم
زیکەڵە و ورد و خوردم
لیباسم بۆ لەبەر کەن
جامانەشم لەسەر کەن
بۆم بیبەستن سۆرانی
زۆر بە پۆختی و بە جوانی
میوان دەبم لەو دییە
گەلێک منداڵی لێیە
ساز دەبین زۆر بە جوانی
دەست دەکەین بە گۆرانی
گۆرانی و لایە لایە
بە دووزەلە و بە نایە
دەست دەکەین بە هەڵپەرکێ
لە نێو شار و لە نێو دێ

نادر ئیسماعیل‌زاده (دیار)

## خەیاڵ

گەر بیر لە تۆ دەکەمەوە
فرمێسک بە چاوما دێتە خوار
بوغزی گریان گەرووم دەگرێ
دەستەکانم هەڵدەلەرزن
پێنووسەکەم خۆی پێ ڕاگیر نابێ
قرچەقرچی لێوەدێ و وردە وردە لێک دەبنەوە
مۆمەکان لە حاست خۆیاندا دەتوێنەوە
نازانم هەستی دڵم بۆ کێ هەڵڕێژم
لە ژێر خاک، لە ژێر بەرد، لە نێو ئاودا بینێژم
هومێدم وایە ڕۆژێک دابێ
ئارەزووەکانم هەمووی وەدی بێ
تا چ بە گوێ، چ بە چاو و چ بە لێو بیچێژم

«ناسر ڕەسوولی»

## «سینەما، جا زۆر بە کورتی»

ئەوەی کە ئەوڕۆکە سینەمای ئێران سەردەمێکی زۆر خراپی خۆی بەسەر دەبات، باسێکی حاشاهەڵنەگرە، نواندن و بڵاو بوونەوەی کۆمەڵێک فیلم بە چیرۆکی سارد و تەنیا بۆ پڕ کردنەوەی (گیشە)، دوورکەوتنەوەی سینەماگەرانی ئێرانی لە سینەمای(معناگرا) و نەبوونی ڕۆشەگری لە سینەمادا، ئەوڕۆکە سینەمای ئێرانی بەرەو کلیشە بردووە.

لە باس کردن سەبارەت بە نمایشی ویدیۆیی و (غیر قانونی)ش خۆ دەپارێزن. کە چ خەسارێکی هەیە لە ڕەوەندی سینەمایدا.

دیارە لە ڕاستیدا سینەماگەران زۆریش خەتابار نین، چونکە نەبوونی بینەری خوازیاری ئەم شێوە فیلمە (واتە فیلم بە چیرۆکی تێکەڵ بە دەروونناسی و فەلسەفەوە) لە خۆیدا هۆی سارد بوونەوەی بازاڕی سینەمای ڕووناکبیری و باس هەڵگرە. ئەگەر ئەوڕۆ فیلمگەلێکی وەک (چە کسی امیر را کشت؟) لە سکانسێکدا کەلک لە دەنگ و ئاوازی گۆرانیبێژێکی(ممنوع‌الاسم) وەردەگرێ و چیرۆکێکی تێکەڵ و هاڵۆز دەدرکێنێ، هیچ هونەرێکی تێدا نییە و ناتوانێ وەک فیلمێکی لە شێوازی باس کراو لە سینەمادا خۆ بگونجێنێ، ئەگەرکوو هەدەف کۆپی هەڵگرتنەوە لە شاکارە هالیوودیەکانە (مظنونین همیشگی، برایان سینگر ۱۹۹۵) و ناساندنی کەسایەتییەکی وەک (کایزر شوزە) کە ئەوە زۆر لاواز و بگرە ناشیانەیە و هیچ دەورێکی لە سینەمای (متفکری)دا نییە.

مەبەست لەوەی کە گوتم بینەر نەماوە، ئەوە بوو کە لە ڕاستیدا ئەوڕۆکە ئەگەر بەرەی گەنج و لاو لە وڵاتی ئێراندا مۆرەی ئەسڵین، ئەوا ئەم مۆرانە (نەک هەموو) لە عەسری هیپ‌هاپدا بەسەر دەبەن و چیان لە فەلسەفە و سینەماکەی داوە و زۆریش حەزیان لە فیلم بوو، کۆمێدی ئێرانی لە خزمەتدایە.

جا لێرەدا لەم بێ‌بازاڕیەدا تۆ وەرە و باس لە سینەمای کوردی بکە.

سینەمایەک کە دەچوو بە بەرهەمەکانی (مامۆستا بەهمەنی قوبادی) نەک لە سینەمای ئێراندا بەڵکوو لە ئاستی نێودەوڵەتیدا خۆ بگونجێنێ بەڵام ئەم سینەمایە هەر لە چەند کاری (قوبادی) و ڕەنگە دووان سێ‌یانێک کورتە فیلمدا لە هونەرمەندانێکی‌تردا مایەوە.

ڕاستی ئەوەیە کە بۆ بەڕێوەبردنی کارێکی سینەمایی پێویستی بە پشتیوانییەکی باشی ماڵی، بە سناریۆنووسی باش، ئەکتەری بە توانا و بە گشتی گرووپێکی ڕێکوپێکی فیلمسازی هەیە. بەڵام

باوەڕ ناکەم بە بوونی هەموو ئەوانەش گەیشتن، دیسان دوای کۆتایی کار، بینەرت دەست کەوێ، هەر ئەو نوقسانە کە سینەمای ئێران بە گشتی هەیەتی.

هێنان و نەهێنانی بەرباسی ئەم کێشەیە لە بابەتێکی گۆڤاریدا هیچ دەورێکی لە ئالوگۆڕەکانی سینەمادا نییە بۆیە بە کورتی وەبیری بەڕێزی خوێنەری دینمەوە کە کاکی خۆم حەیف و سەد حەیف سینەما فەوتا سینەما نەما هەموو بوو بە فشقیات. ئەو دەردە هەڵبەت لە هالیوودیشە کە ئەوڕۆ خۆی بە تکنیکە سینەماییە کۆمپیوتێرییەکانەوە خافڵاندووە و لەشیان ساغ بێ ساڵی ۱۰ فیلمی ئەکشین بەرهەم دێنن.

لە کۆتاییدا پێم‌خۆشە ئاماژە بە یەکێک لە بە نەرخ‌ترین قسەکانی چارلی‌چاپلین بکەم کە دەیگوت: «بۆ بەرهەم هێنانی شاکارێک پێویستم بە «کامیرایەک، پارکێک، پۆلیسێک، ویولونێک و کچێک هەیە، ئەوا ئەوکات دەزانن سینەما چییە».

خۆزگەم بەو کاتە کە بریا سینەما هەر لە قالبی کلاسیکدا مابایەتەوە.

ئەنوەری عەرەب

**هەستی ئاسک**

دڵێکی تەنیا
بۆنی سێوێک و ترسی ئێوارەی ماچێکی لێوت
پێشکەشی تۆیە
کۆڵانی من و کۆڵانی ئەتۆ
خۆشەویستمان گەڵایێکی زەرد
هاورێی پاییز بوو
وەرزێکی ناخۆش
دڵێکی تەنیا
ئێوارەی پاییز، ئێوارەی پاییز
کۆڵانی من و بیرەوەری تۆ...

***

هەموو شتێک تەواو دەکەین
وێنەکانت ئەدەمەوە
شیعرەکانم ئەدەیەوە
شووشە عەترەکەت ئەدەمەوە
گوڵەکانم ئەدەیەوە
بەڵام بیبوورە
ماچەکانت چۆن دەمەوە...؟
...
زەوی لە ئامێز ئەگرم
و
ئەڕۆم بەرەو خودا
لە پاکژگەی لێوەکانت هەناسەیەک ئەکێشم
و
دەچمە ناو دۆزەخی مەمانت
و

بیر لە بەهەشت دەکەمەوە...

...

باپیرانی ئێمە
لە ڕەسەنترین ڕۆژە باشەکاندا
ژیانیان دەست پێکرد؛
ئێمەش لە گنخاوترین
ئێوارەکاندا کۆتاییمان
پێهێنا...

ئەحمەد (تەنیا)

**شانۆی مەرگ**

نیگا
سەرت دانی نەکا لەم چاوەڕوانییەدا
ڕێگاکانت بدزن
کات
درەنگە و تینووی لەنجەکەتم
یادداشتەکانت ئەنووسمەوە
ترس
خورپەکان هەنگاوەکانم ئەدزن
پاکیت بە باڵای خۆیا هەڵئەزنێ
دەستێک ڕاپێچم دەکا
بەرەو خۆشترین لەززەتەکانی تاوان
زەنا؛ زەنایەک دەمگەڕێنێتەوە
ترسێک شانۆی مەرگم نیشان ئەدا
توانیومە گرێ پووچکەی دڵم کردبێتەوە
هەر شەوێک سەر بە ماڵە شیعرێکدا نەکەم
ئاخ خۆشەویستی
خۆشەویستی
خۆشەویستی

***

**سترانی کوکوختی**

خۆ من نایڵێم، قەڵەم دەیڵێ
لە پەیوەندی خۆم و گفتی تۆ
خەونەکانی من و حەزی تۆ
نهێنییەک خۆ ئەدرکێنێ
لێم مەپرسە، زمانم لە گۆ چووە
ویژدانم دیوارێکی لە شەرم هەڵچنیوە

شەوانە پێنووسەکەم
بە دیمانەیەک لەگەڵ حەبا
پێیان‌گووت: مەستی هەوەس نەتگرێ
ڕۆندکی پەشیمانی
مێژووی شاعیریت ئەشواتەوە
تاوانێکی گەورە؛ بەرینگی گرتووم
بە واژە ناحەزەکانی ناو فەرەنگ
کاتێ ئێوارەکانم بەردباران دەکەن
لە جێژوانی خۆم و پەپوولەکەم
ئەمەنم بۆ تاقە ماچێک
تەریقم دەکانەوە
خۆفێکی ئەزەلی گرتوومی
گەڕانەوەیەک لە ناو مزگەوت
ژیانێکی ناو حوجرە
ڕاوەستان لە سەفی نوێژدا
بەسە با گەوجێتی؛ سانەکانم چەواشە نەکات
لە سرتە و خورتەکانی ڕۆژانەم
حەزە ئەهریمەنییەکانم دەمرێنم
لە سترانی کوکوختییەک
گولێک پێدەکەنێ
غەزەلێک لە دەنگی بولبولدا
بە ناکامی مرد
ڕۆژنامەکان باس لە ئەوینی
باران و پەنجەرە دەکەن
ئەمە بوو ڕۆژە نوێکانی شاعیرێک
هۆگری و حەز و تاسەکانم
ئەی ڤینوسە تاقانەکەم
لە تێڕامانی چاوەکانت

وەکوو تەنیاییەکانم
تکـتک
بە ڕۆژدا؛ لە خەزانی پاییز
کۆتایی هەناسەکان ئەکێشن

نووسەر: حوسێن شێربەگی

## کارەسات

من دەڵێم کارەسات و ڕەنگە ئێوە بڵێن بەزمەسات! بە چی؟ بەو ڕووداوەی بەسەر خۆم هات و ئێستاش کە ئێستایە هەر وا واقم وڕ ماوە، لەو ڕووداوانەی ئەو ڕۆژە ئەفسووناویە بە سەرم هات.

لە شارێکدا کە بە ڕاستی لەبەر پیسی و پۆخڵی لە هەموو مەباڵێ دەچوو، لە شار نەبێ! یانی کۆڵان و شوستە و شەقامی هەر هەموو پیس و پۆخڵ و بۆگەن بوو، وەڵڵا جەماوەرەکەشی لەگەڵیدابێ گیرم کردبوو، ئاودەستی گاڕەکەی چۆن بێ و کێی تێدا بژیت؟ من لە شوێنێکی ئاواهادا بوومە دۆست و دیوناسی کەسێک! ئەو کەسەی ئەو باسیتان بۆ دەکەم و ئێوەش موعجیب بن بە کاری خودا.

چۆنی و تەوقەیەک لەگەڵ ئەو دیوناسەدا بکەم، بە داخەوە ناماسیتەوە و تەنانەت حاشا لەو ڕووداو و لەو دۆستی و دیوناسییەش دەکات!

من دەڵێم: کوڕە بە گیانەکەت خۆتی، ئەو جوامێرەی بە هانامەوە هاتی و کارمت جێبەجێ کرد.

بەڵام ئەو دەڵێ: نە، قارداش، ئەو کابرای تۆ دەڵێی، ئەوە مین نیم.

دەڵێم: کوڕە دایکت چاک، باوکت باش، چۆن تۆ نی؟ وەڵڵا تۆی! چۆن لە بیرت نایە سێ مانگ لەمەوبەر پیاوەتی و جوامێرییەکی ئاوەها گەورە و گرانت لەگەڵ مندا کرد و...

بەڵام کابرا پیرەی جەستە وردیلەی پاک و خاوێن، خاوێن کەرەوەی ئاودەستەکانی ئەم شارە دیسانەکەش قسەکەی دووپات دەکاتەوە: نا، نا، قارداش نەء، نەء... مین نیم، ئەوەی تۆ دەڵێی مین نیم! مین سێ مانگ پێش لێرە؛ هەر لێرە نەبووم!... بە گیان خۆم... بە گیان منالم... مین نەء...

نازانم بڵێم چی؟ ئەو ڕۆژەی سێ مانگ لەمەوبەر من بەدەم هێنابوو، خراپم بە سەر هاتبوو، پوول و پارەم ببوونە چۆلەکە و کۆتر و زوو بە زوو لە گیرفان و باخەڵم دەردەپەڕین و دەفڕین و لە کۆتاییدا کە سواری پاس بووم تاکوو بگەڕێمەوە شار و زێدەکەی خۆم، بۆم دەرکەوت پارەم کەمە و شۆفێری پاسەکە سوارم ناکات و دامدەبەزێنێ و ئابڕووشم دەبات؛ دەیجا چارە ناچار لە پاسەکە دابەزیم تا چارەسەرێک بۆ گرفتەکەم بدۆزمەوە.

ئەم کارەساتە، نەبوونی تەنیا پێنج تمەنی بێ قابیل پێکیهێنا؛ بەڵام کارەسات یا بەزمەسات؟ ئاخە کەم هاتن و نەبوونی پێنج تمەن و ڕووداوێکی ئاوا بخووڵقێنێ؟

من لەسەر چوارڕیانی گەورەی شارەکە زۆر ڕاوەستام. جەماوەر دەهات و دەچوو، جەماوەرێکی زۆر و هەمەڕەنگ. بەڵام من زاتم نەبوو داوای یارمەتی لە کەس بکەم؛ لە ڕووم هەڵنەدەهات! زۆرم لە خۆمدا جینگڵ دا، هەوڵم دا بتوانم ڕوو لە کەسێک بنێم و یارمەتی بخوازم، تەنانەت سەعاتەکەم بفرۆشم، نەبوو. کتێبەکانم، ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ناو جانتاکەم بفرۆشم، نەبوو، نەمتوانی! پاس دەهات و دەڕۆیی... ئۆتۆمبیل برایانە و مرۆڤانەم بەدی نەدەکرد... دەیجا وێستا بووم و خۆم دەخواردەوە . بۆ ئاخر چارەسەر هاتمە سەر ئەوەی: لە شارێکی ئاوها قەوغا و گەورەدا، لە چوارڕیانێکی ئاوها جەنجاڵ و پڕ هاموشۆدا و لە نێو چەند هەزار جەماوەردا لە کەس ڕانەبینم یارمەتی لێ بخوازم.و لە ناچاریدا ڕوو بکەمە ئەو سواڵکەرە پیرەی بەردەرگای ئاودەستی گاڕی پاسەکان. هەر ئەو سواڵکەرەی نێو کاتژمێر پێشتر پێنج تمەنم پێبەخشیبوو. ئەوا دەمهەویست بچم و پێی بڵێم: ئاغە مەشهەدی ببوورە؛ من نیو کاتژمێر پێش ئێستا پێنج تمەنم داوە بە تۆ، کە چی ئەوا ئێستا هەوجێنم بەو پێنج تمەنەیە و دەبێ بمدەیەوە...

هەر بەم تەمایەوە ڕووم کردە کابرا پیرەی سواڵکەر و خوداوراستان ئاوهام لە دەم دەرپەڕی:
ئەغە مەشهەدی، بەو خودایە ڕمووده و موعتاد و تلیاکی و بەرەڵڵا نیم، موسافیرم و دەچمەوە بۆ شار و زێدەکەم؛ چاو، ئەم سەد و چەند تمەنەم هەیە، تەنیا پێنج تمەنم کەم و کەسرە! پیاوەتی بکە و ئەم پێنج تمەنم بدەرێ... یارمەتیم بکە... کابرا پیرەی جەستە وردیلە، دەستی کرد بە ناو باخەڵ و گیرفانی پاڵتۆکەیدا، دەستی زۆر لە ناو ئەو گیرفان و باخەڵەدا هێناو برد... لە پڕدا چنگێک پڕپڕ دووسەد تمەن و یەکسەدتمەن و پەنجاتمەنی کردە ناو باخەڵی منەوە. کە چی من ئەو گشتە پووڵ و پارەیەم نەدەویست، ئەو پووڵە چەند هەزار تمەن دەبوو، بەڵام کابرا نەیژمارد و هەر نەژمارده هاویشتیە باخەڵمەوە!
پێم گوت: ئەغە مەشهەدی، من ئەم گشتە پووڵەم ناوێ من تەنیا پێنج تمەنم کەمە و هەر ئەو پێنج تمەنم دەوێ...
کابرا پیرەی جەستە وردیلەی پاک و خاوێن گوتی: برام مناڵ مەبە، تۆ موسافیری، لەمشارەوە تا شاری تۆ دوو سەعاتە ڕێیە. بەڵکەم خوا نەکردە لە ڕێگەدا مایەوە، شایەد کارەساتێک قەوما، بەڵکەم ئەم پاسە لە ناو ڕێگەدا شکا و سواری پاسێکی دیکە بووی؛ با ئەویش پارەی گەرەکە...
قسەم لە زاری ڕفاند و گوتم: ئەغە مەشهەدی شاڵڵا هیچ ناقەومێ، من ئەم گشتە پووڵەم ناوێ...
کابرا پیرە دیسان گوتی: برام مناڵ مەبە؛ موسافیر هەزار مەترسی لەسەر ڕێیەتی... کاکە گیان

سبەینێ جەشنە، جەشنی نەورۆزە، بڕۆ نەورۆزانەیەک بۆ منداڵەکەت بکڕە، بووکەڵەیەک، قوتوویەک شیرینی، نەورۆزانەیەک... دیسانەکە نەمهێشت درێژە بە قسەکانی بدا و کوتم: ئەغە مەشهەدی بگرە ئەوە پارەکەت ئاغا مەشهەدی پارەکەی نەدەویستەوە، وەری نەدەگرتەوە... تەنانەت ڕازی نەدەبوو ئەو پوولە بژمێرێ و بە قەرز بمداتێ... گوێشی نەدەدایە قسەکانم...

ئەو دەستە پڕ لە پوول و پارە گرمۆڵە کراوەی ئەو کە بەرەو من هات؛ بووە باڵندەیەکی نەخشین و باڵ ڕەنگین، بە قەرا حەساری گارەکە گەورە بوو و هەڵمساو تەواوی حەوشە و حەساری گەورە و جەماوەر و پاسەکانی هێنایە ژێر سێبەری خۆیەوە و تەواوی پوول و پارە و جولمێری دونیای کردە باخەڵی منەوە... ئیدی خوم بۆ ڕانەدەگیرا، دەگریام و دەمناڵاند: خودا، خودا، ئەی خودا! هەڵەیە، سەهوە، چۆن شوێنی ئیش کردن و نان خواردن و ڕزق و ڕۆزی ئەم گەورە جوامێرە پیس و پۆخڵترین ئاودەستی جیهانە؟ چۆن دەبێ ئەم کابرا جەستە وردیلەیە جوامێرترین گەورە پیاوی جیهان بێ و کە چی کارەکەی خاوێن کردنەوەی ئاودەست و مەبالی هەرە پیس و گەندوگوواوی جیهان بێ... نابێ، خوایە نابێ، نابێ...

باران دەباری... باران نەیدەهێشت دەنگم بگاتە گوێی خودا... باران نەیدەهێشت دەنگ هەڵبڕم، باران نەیدەهێشت دەنگم بگاتە هیچ کوێ... بەڵام دەست و مستێک، دەست و مستێکی گرمۆڵە و چرچ و لۆچی پیرە پیاوێکی جەستە وردیلە... پارە و پوولێکی بێ ئەژماری نەبژاردراوی دەکردە شاباش بە سەری مندا، دەیکردە نەورۆزانە بۆ ماڵ و منداڵەکەی من، دەیبەخشی بە موسافیرێکی نەدیوی نەناس و جیهان دەکەوتە ژێر سێبەری ئەو دەست و مستەوە...

کە چی گریانێک و بارانێک جیهانی پڕ کردبوو... بارانێک و گریانێک... جیهان... گریان... گریان...

# هیوا

ڕووبەڕووی دانیشتبوو، بە ئارامی دەستە نەرم و ناسکەکەی بە تەوێڵیدا هێنا، چاوە گەشەکانی بڕیە نیگای چاوە کاڵەکانی ئەو: «بە ڕاستی زۆر خۆش بوو، دەمزانی وا دەبێ، بۆیە هاتم بە دووتا، لەو ڕۆژانەیە کە هەرگیز هەرگیز لە بیر ناچێتەوە، چ هەڵپەڕکێیەکی خۆش بوو، بەو سەرمایە هەموو لەشمان وەسەر ئارەقە کەوتبوو، ئەوە نییە تۆش ئارەقەت کردووە و تۆزی شایەکە لە ڕوخسارت نیشتووە، ئەوە بوو شایی، دەزانی بۆ وا خۆش بوو؟ لە بەر ئەوە بوو هەموو خەڵکی بە دڵەوە هەڵدەپەڕین، وێکڕاش بە شایی خۆیان دەزانی، هەر واش بوو، خانە خوێ و برازاوا وەک یەک وا بوون و کەس خۆی بە غەریبە نەدەزانی. دەزانم کە هاتم بە دووتا ئەتۆش زۆرت پێخۆش بوو، ئاخر بە ڕاستی ئەو شایە بێ تۆ هەر تامیشی نەبوو. تۆ هەوێنی ئەو شایە مەزنە بووی، دەشمزانی زۆریشت پێخۆش بوو، ئاڵات لە دەستەوە هەڵپەڕی، بۆیە چوومە دەست ئازادی برای و ئەویشم ناردە دەست تۆوە، دەنا خۆشت باش دەزانی ئەمن زۆرم حەز لە دۆبەدۆ و شتی وا نییە، بە ڕاستی ئەگەر ئاڵام لە دەست تۆدا دی، لەوانە بوو باڵ دەرهێنم، چاوم پڕ بوون لە فرمێسک، ئاخر ئاڵا هەر جوان بوو لە دەست تۆدا هەڵپەڕێ، لەو کاتەدا بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەو دنیایە چەندی گۆڕان بە سەردا دێ، زەمانێک تۆ و ئاڵا هەر نەتاندەوێرا بە سیلەی چاویش لە یەکتری بڕوانن، کەچی ئێستا وای لێهاتووە کە لەبەر چاوی ئەو هەمووە خەڵکەدا لە دەس یەکتردا هەڵدەپەڕن، زانیت ڕاستت دەکوت قسەکەت هاتە دی، هیچمان باوەڕمان پێ نەدەکردی کە دەتکوت: ڕۆژێ دادێ ئەمن و ئاڵا لە نێوەڕاستی ئاوەدانی و لەبەر چاوی هەموو عالەم، تەنانەت «حەمە» دڵپیسی براشیەوە لە گەڕی داوەتدا هەڵپەڕین. ئێمەش دەمانکوت: قەت شتی وا نابێ، مەحاڵە، یانی حەمە دڵپیس دەبێ بەو پیاوەی مانای ئەشق و خۆشەویستی بزانێ و ڕێز لە هەستی مرۆڤ بگرێ. تۆش دەتکوت بەڵێ لە حەمە پیسترەکانیش دەبێ بگۆڕدرێن، ئەمە شەقی زەمانەیە و کەس ناتوانێ خۆی لە بەردا بگرێ. هەر واشی لێهات، قسەکانت هاتە دی و تۆ و ئاڵا لە دەست یەکتریدا هەڵپەڕین و حەمەش ورتەی لێوە نەهات. زۆر لە ئازاد و ئەوان بە گوڕتر هەڵدەپەڕێ».

لە قووڵایی هەناوییەوە هەناسەیەکی ئاگراوی هەڵکێشا، قوڵپی گریانێکی خەست ئەوکی ئاخنیبوو، لێوەکانی وەلەرین کەوتبوو، فرمێسکە قەتیس ماوەکانی دانە دانە بە سەر گۆنا و لاجانگیدا خلۆر بوونەوە، وێنەکەی هیوای سڕی و لەسەر جێگاکەی خۆی دایناوە.

نووسەر: فەلەکەدین کاکەیی

## گوڵ مامۆستای مرۆڤە

(تۆش هەر تەماشای گوڵەباخ بکە. باش لێی ورد ببەرەوە. بۆت دەردەکەوێ (خودا) بە هەموو دڵنەرمی و دڵسۆزی و ڕووخۆشییەکەیەوە، بە هەموو جوانی و کردەوە ڕەنگینیەکەیەوە، لەو گوڵەباخەدا بە بەرجەستەییەوە دیارە.)

ئەوە دەقێکی وتاری شاکر فەتاحی شەهیدە لە ڕۆژنامەی ئاکرێ، ژمارە (٢ لە ١٩٥٠/٧/٢٢ دا)، باونیشانی ئەم وتارەشم هەر لەو وەرگرتووە، لە ژێر سەردێری (لە سروشتی گوڵانەوە گوڵ مامۆستای مرۆڤە)، تاقی کردنەوەیەکی ژیانی خۆی دەنووسێت:

(لەبەر ئەوەی گوێم نەدابووە (یاسای خودایی) و پێچەوانەی بەندەکانی ئەو جووڵابوومەوە. لەبەر ئەوەی لەسەر بیروباوەڕی ناشیانەی... خۆم ڕۆیشتبووم بەڕێوە. سەرگەردانیم زۆر بەسەردا هات... خەم و خەفەتێکی زۆریشم تووش هات... ئەنجامیشم بەوە گەیشت، تووشی هەژاری و نەخۆشی دڵتەنگی بووم. بەڵام بە هۆی ئەوانەوە وریا بوومەوە چاوم کردەوە و گەلێک شتیش فێر بووم و کردەوە و کاریشم ڕوویان کردە چاکی! تا دەڵێت کە (بە هۆی ئەوانەوە). (زۆری پێ نەچوو ژیانم بە تەواوەتی گۆڕا: خەم و خەفەتم گۆڕاو بوو بە کامەرانی. نەخۆشییەکەم گۆڕاو بوو بە تەندروستی. سەرنەکەوتنەکەشم گۆڕا و بوو بە سەرکەوتن).

ئەمجا دەڵێت: (تۆش هەر تەماشای گوڵەباخ بکە...) تا د...

واتە: ئەو (ئەوانە)ی، کە شاکر فەتاح ئاماژەیان بۆ دەکات دەبێت (گوڵ) و (گوڵەباخ) و (سروشت) بن.

(گوڵ)، لێرەدا، بووە بە مامۆستا و ڕێبەر و پیر، ڕێگای چارەی پیشان داوە، چاوی کردۆتەوە، ڕێگەی گەشبینی و خوداناسیی پێناساندووە.

ئەوە تاقی کردنەوەیەکی دەروونیی گرنگی ژیانی شاکر فەتاحە، تێدا لە جەوهەری سروشت نزیک بووەتەوە، وەڵامیشی وەرگرتووە. تاقی کردنەوەکەی لەگەڵ پایەی بەرزی (دانایی) گەورە زانا و فەیلەسووف و ئایین پەروەرە ڕزگار بووەکان، یەک دەگرێتەوە...

کە جووت بوون لەگەڵ سروشت و یاساکانی ژیان و گەردوون، مرۆڤ بە پلەیەکی بەرزی ڕووحی دەگەیەنێت و لە ڕاستیدا چارەسەری خۆی، یا تیماری خۆی، بە دەستی خۆی بێت.

لە وتارێکی پێشووتردا هێنامانەوە کە سروشت خۆی چارەی خۆی دەکات، هەروا مرۆڤ ئەگەر بتوانێت خۆی لەگەڵ یاساکانی سروشت بگونجێنێت، ئەو دەرمانی نەخۆشییەکەی بە دەستی هەمان پزیشکە، کە سروشتە.

بۆ ئەوەی خوێنەواری خۆشەویست بە هەڵەدا نەچێت، مەبەستم لێرە نەخۆشیی فیزیۆلۆژی نییە...
(هەندێ جار نەخۆشی فیزیۆلۆژیش بە دەستی سروشت دەرمان دەکرێت. ئەمەیان بابەتێکی دیکەیە، لێکۆڵینەوەی جیاوازی دەوێ.)
سروشت، لە لای شاکر فەتاح، پەرستگا بووە، کە لە هەموو دیمەنێکیدا ڕوخساری گرنگی تاقیکردنەوەکەشی ئا لێرەدایە، کە هەر مرۆڤێک لە هەر جێگە و پایەیەک بێ. (ساڵی ١٩٩٥ لێکۆڵینەوەیەکم دەربارەی ڕۆشنایی بڵاو کردۆتەوە).
بە واتایەکی دی دەمەوێ بڵێم کە (ژینگە پەروەری)، وەکوو لە حاڵەتی شاکر فەتاحدا دەبینین، بەرەو پایەیەکی رووحی پاک و بەرز هەڵدەکێشێت. وەختێک دەڵێین: بۆ ئەوەی ئەو بەشانەی وجوودتان بدۆزنەوە کە لێتان ون بوونە! ژینگە پەروەری لە کانگای قووڵترین میهرەبانی، مرۆڤدۆستی، خۆشەویستی ژیان و خوداناسییەوە، هەڵدەقوڵێت.
ئەو دەیەوێ مرۆڤ، وەکوو گوڵ، بە کەڵکی هەموو کەس بێت. هەر لەو وتارەیدا دەنووسێت:
(گوڵەباخ مامۆستایەکی جوان و شەنگ و شۆخە. ڕووخۆش و بەخشەندە و ژیرە.)
ئازایە و، دڵی پڕ لە خۆشەویستییە و، کردەوە ڕەنگینە و دادپەروەرە. لە فەرهەنگەکەی ئەودا جیاوازی لە ناوەند گەورە و بچووک و دەوڵەمەند و هەژار و دۆست و دووژمندا نییە. نەترسی لە دڵدا هەیە و نە خۆپەرستی. نە قینی لە دڵدا هەیە و نە ئارەزووی تۆڵە سەندنەوە. چاویشی لەوەوە نییە پاداشتی بدرێتێ یاخود کرێ وەربگرێ. ژیانی ئەو پڕە لە خۆشەویستی و دڵپاکی و ئارەزووی بەخشینی بۆ کەڵکی گشتی).
شاکر فەتاح لە ١٩٥٠/٩/١١ بۆ (ئاکرێ) دەگوێزرێتەوە، تا ١٩٥٠/٩/١٥ دەمێنێتەوە. لەو ماوە کورتەدا، وەکوو هەمیشە، هەوڵ دەدات باخچە و سەیران بکاتەوە و دەوروبەر برازێنێتەوە...
سەیرانگای (کانی زەر)، سەیرانگای(سیپە)، یانەی فەرمانبەران، ئەمجا (بەهەشتی منداڵان) و چەندین کردەوەی چاکی دیکە، تا بە ئەمڕۆش بە جێ دەهێنێت.
لە ئاهەنگی کردنەوەی بەهەشتی منداڵانی ئاکرێ ١٩٥٠/٩/٤ دەڵێت: مەبەست لە دامەزراندنی باخچەیەک بە ناوی (بەهەشتی منداڵان) بە بەرامبەری سەرای ئاکرێ... (ئەوەیە منداڵەکانتان لە رووی لەش و هۆش و دڵ و دەروون و چێژەکەیانەوە بە جۆرێکی وا ڕابهێنین و پەروەردە بکەین کە ببنە مرۆڤی تەواو و کە گەورەش بوون بە کەڵکی نەتەوە و ئەمرو بێن، زانایان و شارەزایانی ژینگە پارێزی لە جیهاندا، بە تایبەتی بۆ وڵاتی جیهانی سێهەم، هەمیشە ئامۆژگاری و ڕێنومایییان ئەوەیە کە باخچەی منداڵان، هەر چەند زیاتر دابمەزرێت، هێشتا کەمە.

له ڕاپۆرتی ئاهەنگی کردنەوەی باخچەکەی ئاکریدا هەروا باسی (ئێستگەی ڕادیۆی منداڵانی ئاکرێ) دەکات کە (دەنگ و باس و ساز و ئاواز گۆرانی و.. لەسەر شەپۆلێک بڵاو دەکاتەوە کە درێژایی پەنجا بستە و ژمارەی ڕۆژی دووشەممەی هەموو هەفتەیەکدا بڵاودەکاتەوە)... (ساڵی ١٩٥٠).

شاکر فەتاح، هەرچی لە دەست هاتووە، لەو سات و کاتەدا، بەخشیوبەتی تا دڵی منداڵان خۆش بکات... ئەو لە ژیانیا پەیڕەوی هونەری (دڵخۆشکردن) بووە، کە بەرزترین هونەری ڕزگاری بەخشی مرۆڤە لە مەینەتەکانی ئێستادا. ئەو کارانەی ئەنجام داوە، یا بە زاراوەی ئەمڕۆ، ئەو چالاکییانەی نواندووە؛ دامەزراندنی سەیرانگاکان، یانە و نووسراوخانە، بەهەشتی منداڵان و ڕادیۆ... بێئەوەی پارە لە حکوومەت وەربگرێت، یا هیچ حزب و ڕێکخراوێک یارمەتیی بدات... بەڵکوو لە پیتاکی خەڵک و توانا و بەهرە و شارەزایی خۆی و خەڵکەکی وەرگرتووە و بەس... ئەمەش پەندێکی دیکەی بە مانا و پڕ بەهایە.

**وتوویژ دەگەڵ بەڕێز خانمی مەریەمی فەتاحی بەڕێوەبەری ناوەندی ئاکسفۆرد لە بۆکان**

**١- خانم فەتاحی تکایە خۆتان بۆ خوێنەرانی گۆوارەکەمان بناسێنن:**

- مەریەم فەتاحیم، تەمەنم سی‌ساڵە، مامۆستای ئینگلیسی و مودیری مەرکەزی فێرگەی ئاکسفۆرد.

**٢- هەر وەک دەزانن بەشێکی زۆر لە خوێندەوارانی وڵاتەکەمان گەلێک دواکەوتوانە بیر دەکەنەوە و عەوامی کوردەواریش بە بیستنی هەر زمانێکی غەیری عەرەبی حوکمی ناڕەوای سەیر دەردەکەن، بفەرموون هەڵسوکەوتی خەڵک چۆنە؟**

- دەبێ بڵێم من یەکەم کەس نەبووم کە لە بۆکان دەستم بە فێرکردنی زمانی ئینگلیزی کرد و ئەو فێرگەیەش یەکەم فێرگە نەبووە، پێش منیش و فێرگەی من مامۆستای گەورەی شارەکەمان ئاغای محەممەد ڕەمەزانی زۆری زەحمەت کێشاوە و ئەرک و زەحمەتەکان لە سەر شانی ئەو بووە.

**٣- پلەی هۆشی و فیکری و موستەعید بوونی مناڵانی کورد بە گشتی چۆن دەبینن؟**

- خۆش‌بەختانە دەتوانم بڵێم منداڵانی ئەم سەردەمە زۆر موستەعیدن، ئێمەش هەوڵی خۆمان دەدەین ئاگاداریان بکەینەوە، سەبارەت بە گرینگ بوونی زمانی ئینگلیزی وەکوو زمانی بەینی میللەتەکان و زمانی زاڵی دونیا.

**٤- پێتان وایە فکر و کەسایەتی کوردی فێرە سەواد و زانیاری شایانی چ پلە و پایەیەکە لە جیهاندا؟**

- بە داخەوە ئەوڕۆ لە جیهاندا کەسایەتییەکان لە ژێر سێبەری ئالا و دەوڵەت و ئابووری وڵاتی خۆیان دەناسرێن، گەلی کوردیش ئەگەر هەلی بۆ برەخسێ لە هیچ گەلێک کەمتر نییە.

**٥- لە بواری ئابوورییەوە قوتابییەکان وەزعیان چۆنە؟**

لەم بوارەدا بە گشتی باشن، ئێمەش تا ئەو جێیەی بۆمان بکرێ زەختی ئابووریی زۆریان ناخەینە سەر، ئەگەر قوتابییەک گرفتێکی لە بواری ئابوورییەوە بێ؛ بەڵام لە باری دەرسییەوە زیرەک بێ دەتوانێ لێرەدا بمێنێتەوە.

**٦- تکایە بفەرموون چوونە سەری تەمەن لەمپەر نییە لە مەڕ داخڵ بوونی ئەم قووتابخانەیە؟**

- باشترین تەمەن بۆ فێربوونی زمانی بێگانە بە بڕوای زمانناسان تەمەنی نێوان ١٢تا ١٦ ساڵانە بەڵام بەم مەعنایە نییە کە لە دوای ئەم تەمەنەدا فێر بوون دژوار یا غەیرە مومکینە بەڵکوو کار کردن و تەمرینی زیاتری دەوێ، بۆ نموونە قوتابیمان هەبوو و هەیە لە تەمەنی ٤٥ ساڵ بۆ سەرێ دەستی پێکردووە و زۆریش سەرکەوتوو بووە.

**٧- تێکەڵ بوون و دواتەکەوتن دەگەڵ کاروانی زانست و ژیان و زانیاریی جیهانی پێویست دەکا گەلەکان زمانی زاڵی جیهانی شارەزا بن باوەڕ و ڕێنوێنتان لەم بارەوە چییە؟**
- تەواو باوەڕم بەوە هەیە، زانینی زمانی زاڵی دونیا یانی ڕۆیشتن بەرەو پێش لەگەڵ عیلم و زانست و دوانەکەوتن لە دنیادا.
**٨- تا ئەمڕۆ لەم ناوەندە کاری فەرهەنگی بەڕێوە چووە؟ چۆن بووە؟**
- کاری فەرهەنگیمان کەم و زۆر کردووە، وەک کۆبوونەوەی هونەری بە بەشداری بنەماڵەی قوتابیەکان و هونەرمەندانی شاری بۆکان، بە شێوەی شەوە شیعر و ئاراستە کردنی مۆسیقای کوردی و ئینگلیزی.
**٩- باسی بەهرەمەندێکی بۆکانتان بە ناوی ناجی سەلیمی کرد تکایە بفەرموون کێیە؟ خاوەنی چ بەهرەیەکە؟**
- ناجیە سەلیمی وەک کچە کوردێکی کارگەردان یەکێک لە هونەرمەندانی شاری بۆکانە کە هەتا ئێستا چەند بەرهەمی وەک کورتە فیلم پێشکەش کردووە، ئەم ناوەندەش هەوڵی خۆی داوە پشتیوانی کارەکانی بێت، هەڵبەت نەک تەنیا بۆ ئەو بۆ هەموو هونەرمەندێک ئامادەی خزمەت گوزارییە.
**١٠- من ئەو ناوەندە وەک قوتابخانەیەکی پێشڕەو دەبینم ئێوە دەڵێن چی؟**
- زۆرمان هەوڵ داوە لە داهاتووشدا هەوڵی خۆمان دەدەین تا تەواو بە ڕادەیەکی ئێستاندارد بگەین ئینشائەڵڵا.
**١١- مرۆڤ وەک دار وایە، هەموو دارێک میوەی نییە، بەڵام فیزیۆلۆژی دارەکان هەموو یەکن.**
- بنیادەمی بەهرەمەند وەک داری میوە وایە لەگەڵ ئەوەدا قازانجی بۆ کۆمەڵ زۆرە، دەبێ زۆرتر ئاگاداری لێ بکرێ هەتا بەهرەیەک بە باشی پێشکەشی کۆمەڵ بکات، ژیان بێ مرۆڤی بەهرەمەند ڕەنگێکی هەیە ئەویش ڕەشایی، مرۆڤی بەهرەمەندیش لێپرسراوی هەیە سەبارەت بە هونەر و کۆمەڵگاکەی دەبێ هەست بە بەرپرسایەتی بکا.
**١٢- چۆن لە ژیان دەڕوانن؟**
- ژیان بۆ خۆمان سازی دەکەین و مەعنای پێدەدەین ژیان لە لای من زۆر جوانە دەبێ لە هەر کات و ساتێکدا کەڵک و بەهرەی لێوەرگرین تا بتوانین فێر بین و چێژ لە ژیان وەرگرین.
**١٣- لە کۆتاییدا وەک سوپاس و ڕێز بۆ بەشداریتان لەم باسەدا بۆ دوا وتەتان هەرچی پێتان باشە بفەرموون:**
- هیچ کات بۆ فێر بوون درەنگ نیە بە تایبەت لە سەدەی بیست و یەکەمدا سەدەی ئینترنێت و گولوبال(Golobali zation) فێر بوونی زمانی ئینگلیزی یەک نیازە.

**شاعیر: دیمەن سوهرابی**

(...)

لێوڕێژ بووە ڕۆحم

لە پیاڵەی بادەی دەستت

سەرڕۆم پێبکە

هەتا هەڵفڕم و

تێبگەیێنم مێژوو

لە ڕۆحی ناناسایێم

هەنیسکی جەستەم

بەندەنگی عەدەن دەشکێنێ

دەروازە بلیندەکانی دۆزەخ دەکرێنەوە

کۆرپەکان لە باوەشی پیسترین مرۆڤەکاندا

ئۆقرە دەگرن و

لە شلێوە بارینی شاردا

هیچ هێلانەیەک خۆی ناگرێ

لێوڕێژ بووە دەستم

لە پیاڵەی بادەی مەرگ

دەهۆنمەوە دووریت

لە دەماری خۆڵەمێشیدا

هەتا بگەم بە مانەوەت

بێمەترسی لە چاوی حیزی

قاڵاوە هەڵۆ نوێنەکان

هەنیسکی ماندوویێم خەریکە دەگا

بە ساڵانێکی درێژ و

هێشتاش بڕوا نەهاتووە

بە چاوی بێتاسە و

ڕۆحی بێتامەزرۆیی

مرۆڤێک وەک من

تا کەی هەڵێم لە دووی
پڕوانامەی ئەشق و
سوێندی سووری مانەوەم
لە خاکی ڕەشی ئەم هۆنراوەدا
بارانی ڕەحمەتی ئەم سەردەمە
هەر کرمەکانی زەوی وەدەردەخا
دەرکە داخراوەکانی عەدەن
لە تەنیشت بەرزەخی نیگامدا
بێ بەزەیین و
لە جێ ماوی
کاروانێک مندا
ون دەبن
ئەوە ساڵانێکە بەردەوامم
بەرپلاوم
سانا چاوەڕوانم
چاوەڕوانم و
-با-ی هیچ بەیانییەک
لە خەوی غوربەت هەڵم ناستێنێ
ساڵانێکە هیچ پووش و پەڵاشێکم
لە چنارستانی تۆدا خۆی ناگرێ

***

## سەری بێموو

سەرەکەم تووکی سپی بوو ئەو جەوری بەشەرە
جا ئەگەر تاسی لەگەڵ بوو ئەوە هەر باسی سەرە
من دەڵێم ناسکە دڵم پێی لێ مەنێ
ئەو دەڵێ عیشقی هەیە ئەو دڵە بۆ تۆ زەرەرە
من بە داوێکی لە پای هەنیە هەڵاویسراوم
وەک پەرەنگێ دەڵەرم ئێستە لە من بێخەبەرە
کەس نەکووژراوە بە شەمشیری برۆ و تیری مژۆڵ
هەر دڵی خومە کە شێتی ئەسەری یەک نەزەرە
من دەڵێم تۆبە دەکەم مەیکەدە ناچم بە تەنێ
ئەو دەڵێ من بەڵەدم دێم لە گەڵت ئەو سەفەرە
پیاوی زانا ئەوەیە زیڕی لەماڵێ بخەوێ
باوەڕی کردووە بەوەی ئەهلی ئەدەب شاروەدەرە
مەکتەبێ چووم و لە هیچ حاڵی نەبووم هاتمە دەرێ
فێری نووسینی شیعر بووم و ئەوینم لەبەرە
هەر پەژاریکی هەمە تێدەپەڕێ سەبری دەوێ
بۆ شەڕی بووک و خەسوو نێوبژی کردن خەتەرە
گەر خەسوو لووتی زلە توورە دەبێ بۆڵە دەکا
بووک لە کن خەڵکی دەڵێ کوانێ ژنە! جادووگەرە
شەوی پاییزێ گەلێ کورتە بە شەرتێکی گوڵم
پێیم بڵێ مانگەشەوە دێمە دەرێ ئەوشۆ وەرە
چیدی غەم ناکەمە سەرباری ئەخۆشی بەدەنم
هەر کەسێ دۆستی منە تۆ غەمەکەم بۆ وی بەرە
هەر چی دەیسزانی بڵاوی کەوە بیبەخشە جەسوور
نەک بڵێن خاوەنی تەبعێکی لەتیفە و لەچەرە

**پێشکەش کردنی: یونس ئەمین‌پوور**

## چەند شیعری بڵاو نەکراوەی: میسباحەددیوانی ئەدەب

جانا چ ئیمان بەری بەو دوو چاوە کاڵەوە
بەو دوو چاوی کاڵەوە، بەو دوو لێوی ئاڵەوە
چ دڵبەرە خاڵەکەی بەر ئەو مینای گەردەنت
وەک پیرۆزە دەدرەوشێ بە سەر زێڕی قاڵەوە
نە هەر من بە دیدارت تەنها لە دین وەرگەڕام
عابید پاکی وەرگەڕان بە زوهدی سەد ساڵەوە
تۆ خودا ئەگەر نەیە لام تێرت کولمە ڕاموسم
با نەچینە ئەو دونیا بە حەسرەت جەماڵەوە
ئەمن کوشتەی نیگاهت تۆ بیخە بەر حاڵم
جارێ لە من ناپرسی چم ئەما بەو حاڵەوە
بە ئەفسوونی پەرچەمت کەوتمە دامی ساحیران
هەر بە داوی ساحیران منت خستە چاڵەوە
چ بکەم دڵ زەوت نابێ، خانەی عەشقم خەرا بێ
من چی و فیراقی تۆ چی چم بە ئاه و ناڵەوە
شەو ماچێکم لێ خواستی فەرمووت کە بێمە ماڵێ
ئەدەب هاتە خدمەتت، تۆ نەبووی لە ماڵەوە

***

ئەوڕۆ کە نیگاری مە دەگەڵ مە بە عیتابە
یەک یەک نیگەهی قەهری دەڵێی تیری شەهابە
زێە کردە لە نێو قەوسی بڕۆی ناوەکی موژگان
تا سەرپەڕی سووفاری هەموو جەور و عیتابە
تووڕەی لە ڕقا خستە سەر ڕوو لە هەموو لا
وەک ماری لە شەڕ باکی بە پێچ و خەم و تابە
دوێنێ کە ڕەقیب ئەیبوو گوازی بە جەنابە
یا ڕەب چ گوناهێک و چ جورمێ لە مە ڕوویدا؟
ئەمڕۆکە لە لای، ئەزیەتی مەعنای سەوابە
بۆ ئەوعی بەشەر ڕۆژی حیساب ئاخیرەتە و بەس
بۆ عاشقی بێچارە هەموو ڕۆژێ حیسابە

دوو شیعر لە: محەممەد ئەحمەدی(سامال)

(١)

دەڵێ- نا
ترووسکەیەک... بە دەماری شەقامدا... دەگوزەرێ
بە دوایەوە زەمان
بە سەر چەند هێڵی هاوڕێکەوە
هەڵات... هەڵات
ناگاتە دڵۆپەیەک باران... کەبەر دەبێتەوە
بە کاتی ئێستا و... من دەبیستم
بۆ تۆ بەڵام
ئەمە گێڕانەوەی هیچ نییە

(٢)

شەقام جمەی دێ لە تەنیایی
بە هێڵەگی سری نیگایدا
وەک چەند هێڵی نەرمی بێزەر... شیتەڵ دەبم
لەم بەستێنە خووساوەدا
بە تەنیا من حەز دەکا شەقام ببڕێ
حەز دەکا تا شوێنی لە دایک بوونی تۆفان
بۆ تۆ بەڵام
ئەمە گێڕانەوەی هیچ نییە

نووسەر: فەرهاد شاکەلی لە ستۆکهۆلم، سوێد

## زمانی کوردی لە ئاستانەی سەردەمێکی تازەدا

لە ماوەی دوو سێ ساڵی ڕابوردوودا سەدان وتار و لێکۆڵینەوە و دیداری ڕۆژنامەوانی لە دەستگاکانی ڕاگەیاندنی کوردستان و ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێتدا لەسەر کێشەکانی زمانی کوردی بڵاو کراونەتەوە. سیمای هەرە زاڵی بەشێکی یەکجار زۆری ئەو نووسین و بابەتانە ئەوە بووە کە لە ڕوانگەیەکی زانستییەوە نەنووسراون و بەڵگەهێنانەوە و هاوپرسەکییەکان بەرهەمی بیرکردنەوەیەکی تەسکی ئیدئۆلۆژی و سیاسی بوونە، کە هیچ پێوەندییەکیان بە زمانەوانی و باسەکانی زمانی کوردییەوە نەبووە. لێکۆڵینەوەی زانستی، لە پاڵ ئامانجێکی بنەڕەتیدا کە گەیشتنە بە ڕاستی و دروستکردنی چەمک و تێگەیشتنێکی وەهایە کە ببێتە بنەمای پێشکەوتن و گەشەکردن لە دیسیپلینە جۆراوجۆرەکانی زانستدا، ئەو بەرزوێستییەیشی هەیە کە لە چوارچێوەی بابەتێکی کێشەئاسادا دەوڵەمەندییەکی زانیاری دروست بکات. ئێمە کە ئەو نووسینانەی لە بواری کێشەکانی زمانی کوردیدا نووسراون و دەنووسرێن بەسەر دەکەینەوە، دەبینین هیچ مەرجێکی زانستییان تێدا ڕەچاو نەکراوە. ڕەنگە تاکوتەرا نووسین هەبن کە ڕێڕەوپەڕن و ناکەونە بەر ئەو هەژارییە زانستی و ئیپستیمۆلۆژییەی کە بووەتە دیاردەیەکی ئاشکرا و سەردەست لە ئەمڕۆی فەرهەنگی کوردیدا.

بابەتی ئەو زنجیرە وتارەی لەم ژمارەیەوە بڵاوی دەکەمەوە، زمانە، زمانی کوردی بەسەر دوو پرسیار، یا دوو کێشەدا دابەش دەبێت:

**یەکەم: ئەلفوبێ**

کورد دەبێ چ ئەلفوبێیەک بە کار بێنێت؟ ئەو ئەلفوبێیەی کە چەند سەدەیەکە بە کاری دەهێنێت و هەموو ئەدەبی کلاسیکی کورد و بەشی هەرە زۆر و گرنگی ئەدەبی تازەیشی پێ دەنووسرێت؟

یا ئەو ئەلفوبێی لاتینی تورکییەی کە نزیکەی ٦٠ تا ٧٠ ساڵێکە دامەزرێنراوە، بەڵام تەنیا لە ماوەی ١٥-٢٠ ساڵی ڕابوردوودا بە شێوەیەکی سنووردار، لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا بە کار هێنراوە و بەشێکی یەکجار کەمی ئەدەبی کوردی، بە زاراوەی کوردیی باکوور، پێ دەنووسرێت؟ ئەم دوو ئەلفوبێیە لە ڕووی دەنگەوە تا چ ڕادەیەک وەڵامی پێویستییەکانی زمانی کوردی دەدەنەوە؟ ئایا بە کردەوە، دەکرێ نەتەوەیەک هەروا بە ئاسانی واز لە ئەلفوبێیەک بهێنێت و دەست بکات بە کارهێنانی ئەلفوبێیەکی دیکە؟ ئایا کاریگەری وەها تا چ ڕادەیەک زیان بە نەوەکانی داهاتوو دەگەیێنێت و لەو گەنجینە فکری و ئەدەبی و زانیارییەی

ئەمڕۆ چەندی دەگاتە دەستی ئەوان؟ لەم ڕووەوە هەم ئەزموونی بەشی هەرە زۆری گەلانی دنیامان لە بەردەستدان، کە خاوەنی فەرهەنگ و شارستانەتی دێرین و دەوڵەمەندن و لە دنیای ئەمڕۆیشدا، لە پلەیەکی یەکجار بەرزی سیاسی و ئابووری و فەرهەنگیدا نەخشیان هەیە، بەڵام هەرگیز دەستبەرداری فەرهەنگ و شارستانەتی خۆیان، کە ئەلفوبێ یەکێکە لە کۆڵەکە پتەوەکانی، نەبوون. هەمیش ئەزموونی تورکیای «بە ناو» مۆدێرن و تازە»، کە بە هۆی سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی مستەفا کەمال ئەتاتورکەوە، ئەلفوبێی لاتینی بە سەر گەلانی تورکیا داسەپاند و بە ناوی تازە کردنەوە و نزیک بوونەوە، لە ئەورووپاوە، نەتەوەی تورکی لە فەرهەنگ و شارستانەتی ڕۆژهەڵات دوور خستەوە، بەڵام هەرگیزیش نەیتوانی ببێت بە ئەورووپایی.

دووهەم زمانی ستاندارد یا زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو: ئایا دەتوانین بڵێین کوردی زمانێکی ستاندارد و یەکگرتووە؟ ئایا ئەو دوو شێوە ئەدەبییەی کە ئێستا لە ئارادان، هەر یەکەیان زمانێکی ئەدەبی و ستانداردە، یا دەتوانێت ئەو ڕۆڵە ببینێت؟ ئایا دەبێ کورد یەکێک لەم دوو شێوەیە هەڵبژێرێت، یا بە تێکەڵکردنی هەردوویان زمانێکی تازەو جیاواز «دروست بکات»؟ ئایا هەر چارەسەرو ئەنجامگرییەک ئەمڕۆ ئێمە لە کوردستانی خوارووودا(خوارووی کوردستان یا کوردستانی عێراق) پێیبگەین، تا چەند بۆ بەشەکانی دیکەی کوردستان گرنگە و دەکرێ پێڕەوی بن؟ لەم جۆرە پرسیارانە زۆرن و بەشی هەرە زۆری ئەو کەسانەی لە دوو سێ ساڵی دواییدا، لەم بوارەدا دیداریان لەگەڵ کراوە، یا وتاریان نووسیوە، لێی نزیک کەوتوونەتەوە و هەوڵیان داوە بە پێی بۆچوونی خۆیان وەرام بدەنەوە و بابەتەکە دەوڵەمەند بکەن.

لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی بابەتی ئەلفوبێ و زمانی ستاندارد، هەر بەوە نابێت کە نووسەرێک یا ڕووناکبیرێک بە پێی حەز و میزاج، هەڵوێست لەبارەیەوە وەربگرێت. ئەم بابەتە ڕەگوڕیشەیەکی زانستی و سیاسی و مێژوویی و فکریی قووڵتری هەیە و بە سەدان دەزووی فەرهەنگی و ئیدئۆلۆژی و زانیاری بەستراوە بە ئێستا و داهاتووی نەتەوە و نیشتمانێکەوە کە هێشتا لە سەرەتای خۆدروستکردن و خۆپێگەیاندندایە.

ئەگەرچی کێشەی ئەلفوبێ پێشتریش هەندێ جار بووەتە بابەتی گوتوبێژ و نووسین، بەڵام لەبەر ئەوەی بازنەی خوێنەر و خوێنەواری وەک ئەمڕۆ فراوان نەبووە، باسەکە هەر لە ناو وتارێکی کەم ماوەتەوە و گەیشتووەتە ئێمە. ئەو وتارانەش تا ڕادەیەکی زۆر لە کرۆکی ڕاستەقینەی باسەکەوە دوورن و تەنیا جۆرێکن لە پێداهەڵدان یا هێرش بردنە سەر، بێ ئەوەی شۆڕ ببنەوە بۆ ناو ڕەگە زانستییەکانی بابەتەکە.

زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو، یا زمانی ستاندارد، وەک هەندێ لە لێکۆڵەرەوان پێیان خۆشە ناوی لێ بنێن، رەنگە لە بازنەیەکی فراوانتردا باس و گوتوبێژی لەسەر کرابێت. ئەو نووسەر و رووناکبیر و زمانزانانەی بەشداریان تێدا کردووە، نەک تەنیا لە روانگەیەکی زانستی و زمانەوانییەوە لێی کۆڵیونەتەوە، بەڵکە هەوڵیان داوە باسەکە بەستنەوە بە پاشخانی مێژوویی و ناسۆ سیاسی و شارستانەتییەکانی دوارۆژی کوردیشەوە. وا پێ دەچێت لە کۆنگرەی مامۆستایانی کوردیشدا لە شەقلاوە، هاوینی ١٩٥٩، ئەم دوو باسە؛ زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو و ئەلفوبێ، گرنگترین بەشی بەرنامەکانی کۆنگرەکە بووبێتن.

دوای رووخان و هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریی عوسمانی، کوردستانی باشوور، یا کوردستانی عێراق، تاکە بەشێکی کوردستان بووە کە تێیدا مەسەلەی زمانی کوردی و خوێندن بە زمانی کوردی و ئەو بابەتانەی سەر بەو باسەن، بووبێتنە بڕگەیەک لە بەرنامەی کاری نووسەران و رووناکبیران و سیاسەتمەداران و رێکخراوە سیاسییەکانیشدا ئەو گەشەکردنە فەرهەنگییە فراوانەی لەو بەشەی کوردستاندا رووی داوە، پێویستی گوتوبێژێکی وەهای هێناوەتە گۆڕێ، بەڵام دیسانیش هەرگیز نەبووەتە باسێکی وەها گەرم و گشتگر کە رووبەڕوو بوونەوەی لێوە پەیدا بووبێت. لە ساڵانی یەکەمی دروست بوونی سیستەمی کۆماریدا لە عێراق، رەنگە گرنگترین سەکۆیەک ئەم باسەی لەسەر کرابێت، کۆنگرەی مامۆستایانی کورد بووبێت لە شەقلاوە. ساڵی ١٩٧٠یش کە رووبەری بەکارهێنانی زمانی کوردی وەک زمانێکی رەسمی لە عێراقدا و وەک زمانی خوێندن و فەرهەنگ لە کوردستاندا، زۆر فراوانتر بوو، لەوانە بوو باسێکی وەها ببووایەتە هۆی کێشە و ئاژاوەیەکی زۆر لە ناو نووسەران و رووناکبیران و دەستەڵاتداراندا، بەڵام سەرکردایەتیی سیاسیی ئەو کاتەی کورد بە شێوەیەکی زۆر ژیر و دووربینانە، رێگەی لەوە گرت ئەم بابەتە بێتە بەرەیەکی‌تر، بۆ ئەوەی دوژمنێکی درندەی وەک بەعس لێیەوە دزە نەکات و بۆ سوودی خۆی بە کاری نەهێنێت.

ئەمڕۆ کە باشووری کوردستان وەک هەرێمێکی فیدێرال لە رووی سیاسی و کارگێڕی و فەرهەنگییەوە تا ئەندازەیەکی باش سەربەخۆیی و پێشکەوتنی بە دەست هێناوە، بێگومان مەسەلەی زمان دەبێتە یەکێک لە بابەتە هەرە گرنگەکانی ئێستا و پاشەرۆژی کوردستان. ئەوەی ئەم سەردەمەی لە سەردەمەکانی پێشوو بە تەواوی جیا کردووەتەوە ئەوەیە کە پێوەندیی فەرهەنگی و سیاسی لەگەڵ پارچەکانی دیکەی کوردستاندا لە ئاستێکی بەرزتر و گەرمتر و چڕتردایە. هەلومەرجی فەرهەنگی و بەکارهێنانی زمانیش لەو بەشانەی کوردستاندا لە گوێرەی جاران زۆر گۆڕاوە. ئێستا لە هەموو بەشەکانی دیکەی کوردستاندا زمانی کوردی،

ئەگەر بە رادەیەکی کەم و سنوورداریش بێت، بۆ نووسین و بڵاوکردنەوە بە کار دەبرێت، هەر چەندە ناکرێ ئەو بەکارهێنانەی ئەوێ لەگەڵ پێشکەوتنی یەکجار فراوان و بەرچاوی زمانی کوردی لە کوردستانی عێراقدا بەراورد بکرێت. ئەنجامێکی مەنتقیی ئەم ڕاستییەش ئەوەیە کە هەر بێت یا ناڕاستەوخۆ، کار دەکاتە سەر بەشەکانی دیکەی کوردستانیش. هەر بەم پێیەش ڕووبەری باسەکە و بازنەی بەشداری کردن لە لێکۆڵینەوەکاندا هێندە فراوانە کە لە مێژووی فەرهەنگیی کوردستاندا هەرگیز هاوشێوەیەکی نابینین.

ئەم فراوانبوونە ڕەنگە وا لێک بدرێتەوە کە نیشانەیەکی ساغ و سەلامەتیی کەشی فەرهەنگییە و ئەوە پیشان دەدات کە کۆمەڵگەی خوێندەواری کورد بلبەتە گەرم و خاوەندییەکان لە ڕێگەی گوتوبێژی زانستی و بە شێوەیەکی شارستانانە یەکالا دەکەنەوە. بە خوێندنەوەی بەشێک لەو وتار و لێکۆڵینەوە و نووسینانەی لەم بوارەدا دەنووسرێن و بڵاو دەکرێنەوە، هەر زوو تووشی بێئومێدی ئەبین، چونکە بە دەگمەن هەڵدەکەوێت نووسینێک بخوێنیتەوە بە بیرێکی زانستی و بە پێی پێوەرە زانستییەکانی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە نووسرابێت.

مەرج نییە ئەوەی باسی زمان دەکات، دەبێ هەر زمانەوان بێت، بەڵام مەرجە بایی ئەوە شارەزای ئەو زانستە بێت کە لە ڕووی بەڵگە و بەڵگەکارییەوە پشت بە بنەماکانی تیۆرییە زانستییەکان ببەستێت. شارەزایی لە زانستێکدا، بە لای منەوە، هەرگیز مەعنای ئەوە نییە ئێمە هەموو بنەما و هەموو ئەنجامگرییەکانی ئەو زانستە و ئەو تیۆرییانەی سەر بە زانستەکەمان پێ ڕاست بێت و شوێنی بکەوین. ئەمە بە تایبەت لە بواری زانستە مرۆڤانەکاندا(The humanities) ڕاستە. بەڵام خۆبەستنەوە بە میتۆدۆلۆژیی لێکۆڵینەوەی زانستەوە گرنگ و پێویستە. من خۆشم کە ئەم قسەیە دەکەم، خۆم بە زمانزان دانانێم، ئەگەرچی لە ماوەی بیست‌وپێنج ساڵی ڕابوردوودا هەوڵم داوە شارەزایی لە زمانزانیدا پەیدا بکەم و خۆم فێر بکەم.

ڕەنگە خوێنەری ئەم نووسینە بۆ ئەوە بچێت کە ئەم ئاژاوەیەی من باسی دەکەم لەبەر ئەوە بێت کە زمانی کوردی خۆی زمانێکی سەرەتایی و پرشوبڵاوە و بەپێی بنەماکانی ڕێزمان و لێکسیکاڵ و گۆکردن کاری بۆ نەکراوە و ناکرێ داوای ڕێکوپێکییەک بکەین کە دروست نەبووە. بیرکردنەوەیەکی وەها، بێگومان، دوورە لەو ئەنجامگرییانەوە کە زانستی زمان پێمان دەڵێت. ئەخشی زمان، تەنانەت زمانی قسەکردنیش، نیشاندەری گرژ و ناسنامەیە. ئەندامی کۆمەڵەکەی خۆی و قسە دەکات، یەکسەر هەستی پێ دەکەن کە شێوەی قسەکردنی گۆڕاوە. ئەم نۆرمە زمانەوانییە دەبێتە پێوەرێک بۆ ئەوەی ئەندامێکی کۆمەڵەکە باسی زمانی«خۆمان» و زمانی «ئەوان» بکات.

لە کۆمەڵێکدا کە زمانی نووسینی هەبێت و سیستەمێکی پێشکەوتووی خوێندن و پەروەردەی تێدا دامەزرابێت، چەمکی «زمانێکی ڕاست» بە شێوەیەکی ڕەهاتر وەردەگیرێت: ئەو زمانە شێوەیەکی ڕاستی قسە کردن و تەنانەت نووسینیشی هەیە، کە خەڵکە «خوێندەوارەکە» بە کاری دەهێنن. واتە ئەوەی وەک ئەوان قسە بکات و وەک ئەوان بنووسێت ڕاستە. ئەوە ئەو شێوە ڕاستەیە کە لە خوێندنگەکاندا دەخوێنرێت و کۆد دادەنرێت (واتە بنەما و ڕێوجی دادەنرێت) بۆ ڕێزمان و فەرهەنگەکەی. هەروەها ئەکادیمیا و ئەنجومەن بۆ مشتوماڵ کردن و چاودێری کردنی زمانەکە دروست دەکرێن. هەموو ئەم هەنگاوانە بەشێکن لە پرۆسەی پەیدا بوونی زمانی ستاندارد.

لە کوردستاندا زۆر دەمێکە ئەو پرۆسێسە بەڕێوە چووە و بەرهەمێکی باشیشی هەبووە، واتە ئەو زمانە کوردییە ستانداردەی لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی ڕابوردووەوە کاری بۆ کراوە و لە چل و پەنجا و شەستەکاندا بنەڕەتەکانی داڕێژران و لە سەرەتای حەفتاکاندا گەیشتە پلەیەکی یەکجار بەرزی ڕێکوپێکی و ستاندارد بوون. بەرهەمێکی ئەو هەموو کۆششەی سەدەی ڕابوردوو ئەوە بوو کە کۆمەڵێک نووسەر و ڕووناکبیری گەورە دروست بوون، کە دەتوانین بڵێین «کوردیی ڕاست» ئەوەیە ئەوان نووسیویانە و دەینووسن. ئەمڕۆش دیسان ئێمە کۆمەڵێک نووسەر و ڕووناکبیرمان هەن کە زمانی نووسینی ئەوان زمانی ستانداردی کوردییە. من کە تێکستێک یا کتێبێک دەخوێنمەوە و دەڵێم ئەمە کوردییەکی خراپە، یا ئەمە کوردییەکی باشە، بە ڕاستی لە مێشک و بیر کردنەوەمدا پێوەرێکی زمانەوانی و ئیستێتیکی هەست پێدەکەم و پەنای بۆ دەبەم و دەیکەمە بڕیاردەری ڕاستی و ناڕاستیی زمانی کوردی. ئەو پێوەرە زمانەوانییە هەر ئەوەیە کە لە بەرهەمی نووسەرە گەورە و کوردیزانەکانەوە هەڵهێنجراوە و بووەتە بنچینەی زمانی ستانداردی کوردی.

ئەوەی ئەمڕۆ لە کوردستاندا ڕوو دەدات ڕووخاندن و هەڵوەشاندنەوەی ئەو دەستکەوتە گەورە نەتەوایەتییەیە، واتە هەڵوەشاندنەوەی زمانی ستانداردی کوردی، لەبەر هەندێ بەرژەوەندی تەسک و بێنرخی ناوچەیی و سیاسی و ئیدئۆلۆژی. لە کاتێکدا سەرکردایەتیی سیاسیی کوردستان لە شەست و حەفتاکاندا (مەبەستم بارزانیی گەورەیە) زۆر ژیرانە پشتیوانیی ئەو پرۆسێسی ستاندارد بوونەی دەکرد و دەیچەسپاند، سەرکردایەتیی سیاسیی ئەمڕۆی کوردستان ڕێک بە پێچەوانەی ئەوساوە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، یەک بە یەک بنەما و کۆمەڵەکانی ئەو زمانە ستانداردە دەڕووخێنێت و هەڵدەوەشێنێتەوە. ئەو دەستگا بەناو زانستییانەی سەرکردایەتیی سیاسیی ئەمڕۆی کوردستان دایمەزراندوون، هەر هەموویان

خزمەتی ئەو ڕووخاندن و هەڵوەشاندنەوەیە دەکەن. ئەنجامی ئەم بارە کارەساتامێزە ئەوەیە کە پێوەری زمانی ستانداردی کوردی و «کوردییەکی ڕاست»، تەنیا تێکست و نووسینی ئەو نووسەر و ڕووناکبیرانەیە کە بەرهەمی ئەو سەردەمەی ڕابوردوون و ژمارەیشیان، ئەگەر زۆریش بە گەشبینی تەماشای بکەین، ڕەنگە خۆی بدا لە پانزدە بیست کەسێک. دەستگا زمانەوانی و پەروەردەیی و فەرهەنگی و بەناو زانستییەکانی ئەمڕۆی کوردستان زۆر لەوە لاوازترن بتوانن جارێکی دیکە ڕووناکبیر و نووسەری وەها بەرهەم بهێنن.

بەشی زۆری نووسەر و ڕووناکبیرانی شارەزای کورد بە گشتی لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەو شێوە زمانەی ئێستا لە کوردستانی عێراق و تا ڕادەیەکیش لە کوردستانی ئێراندا ڕۆڵی زمانی ستاندارد (ڕەسمی) دەبینێت، تاکە شێوەیەکی زمانی کوردییە کە دەتوانێت و دەبێ بکرێ بە زمانی ڕەسمیی کوردستان. کە باسی کوردستانیش دەکەن مەبەستیان هەموو کوردستانە، واتە ئەو بەشانەش کە ئەمڕۆ بواری بەکارهێنانی زمانی کوردییان تێدا نییە. بەڵام هەر لە ناو ڕووناکبیر و نووسەراندا کەسانێک هەن ئەوە جەخت دەکەن کە ئەوان باس لە کوردستانی عێراق دەکەن، بەو پێیەی کە تەنیا لەو بەشەی کوردستاندا زمانی کوردی ستاتووسێکی ڕەسمیی هەیە و ناکرێ ئێستا باسی بەشەکانی دیکەی کوردستان بکەین. دەبێ سەرنجی ئەوەش بدەین کە تەقریبەن هەر هەموو ئەو شارەزایانەی لە بارەی زمانی کوردییەوە دەنووسن، ناونانی ئەو شێوە زمانە بە «سۆرانی» بە هەڵە دادەنێن و لەجێی ئەوە ناوی «کوردیی ناوەندی و ناوەڕاست یا کوردیی خواروو» بە ڕاست دەزانن. ئێستا ئیدی ئەوەش شاراوە نییە کە ناوهێنانی ئەو زمانە ئەدەبییە وەک «سۆرانی» مەبەستێکی نازانستی و تەکتیکیی لە پشتەوەیە بۆ بچووک پیشاندان و داشکاندنی نرخی ئەدەبی و فەرهەنگیی زمانە ئەدەبییەکە.

کاتێ نووسەر و ڕووناکبیری کورد ئەو شێوە زمانە بە باشترین و گونجاوترین شێوە دادەنێن بۆ ئەوەی بکرێتە زمانی ڕەسمیی کوردستان، دیارە کۆمەڵێ بەڵگەی مێژوویی و زانستی دەهێننەوە بۆ پشتگیریی هەڵوێستەکەیان. ئێمە دەتوانین ئەو بەڵگانەی لای زۆربەی نووسەران دووبارە دەبنەوە بەم جۆرە کورت بکەینەوە:

١- کوردیی خواروو دەوڵەمەندترین شێوە زمانی کوردییە، چونکە هەم لە قۆناغی کلاسیکدا و هەمیش لە قۆناغی تازەدا ئەدەبیاتێکی فەراوان و دەوڵەمەندی پێ نووسراوە و کۆمەڵێک لە نووسەر و شاعیرە هەرە گەورەکانی کوردستان بەم شێوەیە بەرهەمەکانی خۆیان نووسیون.

٢- بە پێچەوانەی دیالێکتەکانی دیکەی زمانی کوردییەوە کە هەر یەکێکیان لە سەردەمێکدا زمانێکی ئەدەبیی ناوچەیەکی کوردستان بووە و دواتر بە هۆی هەڵوەشانەوەی ئەو دەسەڵاتە

سیاسییەوە کە بووبووە پاڵپشتی، ئەوانیش ڕۆڵی خۆیان لە دەست داوە، کوردیی ناوەڕاست هەر لە سەرەتای دامەزرانییەوە وەک زمانێکی ئەدەبی و تا ئەمڕۆش، بێناوبڕ، ئەو نەخشەی هەبووە. ئەمە وا دەکات کە بێتە تاکە شێوەیەک کە مێژوویەکی بێ ڕاوەستان و بێناوبڕی لە پشتەوەیە.

٣- کوردیی ناوەڕاست یا خواروو لە سەردەمی پاشایەتیی شێخ مەحموودی حەفیدادا زمانی ڕەسمی حووکومەتی کوردستان بووە، هەروەهاش لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا بە سەرکردایەتیی قازی محەممەد دیسان زمانی ڕەسمی کۆماری کوردستان بووە. لە سەردەمی دەسەڵاتی شۆڕشی تازەشدا دیسان هەر کوردیی خواروو زمانی ڕەسمی دەستگاکانی شۆڕش بووە لە سەرتاسەری کوردستانی عێراقدا، چ ئەو کاتانەی خەباتی چەکدارانە کراوە و چ ئەو ساڵانەش کە سەرکردایەتیی سیاسی بزووتنەوەکە دەسەڵاتی سیاسی و کارگێڕی بە دەست بووە. ئێستاش لە ساڵی ١٩٩٢ەوە کە هەرێمی کوردستانی عێراق بە شێوەیەکی ڕەسمی حوکوومەتی فیدرالییە، دیسان هەر ئەو شێوە زمانە زمانی ڕەسمی حوکوومەت و سیاسەتمەدار و سەرکردەکانی کوردستانە، هەر بەو هۆیەشەوە لە بواری سیستەمی کارگێڕی و ڕۆژنامەگەری و دیپلۆماسی و سیاسیدا بە شێوەیەکی فراوان گەشەی کردووە و لە ڕووی زاراوەسازییەوە دەوڵەمەندتر بووە.

٤- کوردیی خواروو لە ماوەی ٩٠ ساڵی ڕابوردوودا زمانی ڕەسمیی خوێندن و پەروەردە بووە لە خوێندنگەکانی کوردستانی عێراقدا، لە پلە جیاوازەکانی خوێندندا، لە سەرەتاییەوە تا دەگاتە زانستگە، سا ئیتر ئەو سیستەمی پەروەردەیە لە ناوچەیەکی سنوورداردا بووبێت یا سەرتاسەری کوردستانی گرتووەتەوە و هەر بەو شێوەزمانەش داڕێژراوە.

٥- لە بواری ڕۆژنامەگەری و کتێب و وەرگێڕاندا، کوردیی خواروو تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر پێشکەوتووە و شاکاری زۆر گەورە و گرنگی پێ نووسراوە و زۆر لە شاکارە ئەدەبی و زانستییەکانیش تەرجەمەی ئەم شێوە زمانە کراوە.

ئەگەر چی کوردیی خواروو ئێستاش نەخشی زمانێکی ڕەسمی و ستاندارد دەبینێت، بەڵام دەکرێ بەوە دەوڵەمەندتر بکرێت کە وشە و زاراوە و دەربڕین لە دیالێکتەکانی دیکەی زمانی کوردییەوە وەربگرێت، بە تایبەتی ئەوانەیان کە پاشخانێکی ئەدەبی و فەرهەنگیان هەیە، وەک کوردی(کرمانجی)ی سەروو و هەورامی.

یەکەم: ڕێنووس و ئەلفوبێ

ئەلف: ڕێنووس یا ڕاستنووسی (Orthography)

پاخشانێکی مێژوویی، بەکورتی

کێشەی ڕێنووس لە زمانی کوردیدا یەکێکە لەو کێشانەی کە هەر لە زۆر زووەوە زمانزانانی کورد هەستیان پێ کردووە و هەوڵیان داوە چارەسەری بۆ بدۆزنەوە، بەو ئامانجەی کە کورد هەستیان پێکردووە و هەوڵیان داوە چارەسەری بۆ بدۆزنەوە، بەو ئامانجەی کە بتوانرێ وشەی کوردی بە شێوەیەکی ڕاستی وا بنووسرێت کە لەگەڵ شێوەی گۆکردنی وشەکاندا و لەگەڵ دەنگەکانی زمانی کوردیدا بگونجێت. دیارە کێشەی ڕێنووس تەنیا پێبەستی دەنگ (لێرەدا مەبەستم فۆنەتیکە) نییە، بەڵکە پێوەندییەکی زۆریشی بە ڕێزمانەوە، بە مۆرفیمی وشەکانەوە و بە سینتاکسیشەوە، هەیە.

چارەسەری کێشەکانی ڕێنووسی کوردی بە کۆمەڵێ قۆناغی جیاوازدا تێپەڕیوە و کارێکی یەکدەست و یەکگرتوویش نەبووە، چونکە نە دەستگایەکی سیاسی و کارگێری و نە دەسگایەکی فەرهەنگیی ناوەندی نەبووە تا ئەم هەوڵدان و چارەسەرانە یەک بخات. وا پێ دەچێت زمانزانانی کورد، یا ئەو کەسانەی سەروکاریان لەگەڵ نووسینی کوردیدا هەبووە، لە پێشدا چارەسەریان بۆ کۆنسوناتەکان دۆزیوەتەوە و دواتریش بزوێنەکان (ڤاوڵ یا ڤۆکاڵ). من چاپی یەکەمی فەرهەنگەکەی شێخ یوسف زیائوددین پاشای خالیدیی مەقدسی (١٨٤٢-١٩٠٦)م لایە کە ساڵی ١٨٩٤ چاپ کراوە. لەوێدا نووسەر بۆ دەنگەکانی (پ،چ،گ،ژ) تیپ یا نیشانەی تایبەتی داناوە.

ڕەنگە ئەمانە زۆر گرینگ نەبن چونکە پێشتر لای فارس ئەم تیپانە هەبوون و کوردیش چاوی لەوان کردووە، بەڵام سێ نیشانە لەو فەرهەنگەدا بە لای منەوە یەکجار گرنگن؛ دەنگەکانی(ڤ) و (ۆ) و (ێ) کە نیشانەی تایبەتی خۆیان هەیە. ئێمە دەزانین دەنگی (ڤ) لە زمانی فارسیشدا هەیە، بەڵام ئەوان هەر بە (و) دەینووسن چونکە بە هۆی بە دوای یەکداهاتنی بزوێن و نابزوێنەکانەوە دەکرێ بێهەڵە بخوێنرێتەوە. گرنگیی کارەکەی یوسف پاشا ئەوەیە کە بۆ ئەوەی ئەرکێکی زۆر نەخاتە سەر تیپی (و) هاتووە تیپی (ڤ)ی بۆ دەربڕینی ئەو دەنگە بەکار بردووە. پێموایە ئەوە یەکەمین چاپەمەنیی کوردیە کە تیپی (ڤ)ی تێدا بە کار برابێت. یوسف پاشا بیری لەوەیش کردووەتەوە کە بزوێنەکانی (ۆ) و (ێ) دەبێ نیشانەی تایبەتی خۆیان هەبێت، هاتووە ئەو دوو تیپەی بەو شێوەیە نووسیوە کە لە جێی ئەو کڵاوەی، یا ئەو (حەوت)ەی، ئێمە ئەمڕۆ لەسەر ئەو دوو تیپەی دادەنێین، ئەو(هەشت)ێکی لە ژێریاندا داناوە.

نموونەیەکی دیکە ئینجیل(بایبل)ی مارقۆسە کە وەرگێرانە کوردییەکەی ساڵی ۱۹۹۰ چاپ کراوە و لەوێدا وەرگێڕ تیپی(ڵ)ی بە کار بردووە. لە بەر ئەوەی ئەو بەشەی ئینجیل کراوە بە کوردیی و لەوێدا وەرگێڕ تیپی (ڤ)ی تێدا بە کار بردبێت.

یۆسف پاشا بیری لەوەیش کردووەتەوە کە بزوێنەکانی (ۆ) و (ێ) دەبێ نیشانەی تایبەتی خۆیان هەبێت، هاتووە ئەو دوو تیپەی بەو شێوەیە نووسیوە کە لە جێی ئەو کڵاوەی، یا ئەو(حەوت)ەی، ئێمە ئەمڕۆ لە سەر ئەودوو تیپەی دادەنێین، ئەو (هەشت)ێکی لە ژێریاندا داناوە.

نموونەیەکی دیکە ئینجیل(بایبل)ی مارقۆسە کە تەرجەمەی کوردییەکەی ساڵی ۱۹۹۰ چاپ کراوە و لەوێدا وەرگێڕ تیپی (ڵ)ی بە کار بردووە. لەبەر ئەوەی ئەو بەشەی ئینجیل کراوە بە کوردیی موکریانی و لەو دیالێکتەیشدا، وەک دەزانین، بە (خودا) دەگوترێ (خوڵا)، کابرا هاتووە (حەوت)ێکی چکۆلەی لە سەر تیپی لام (ل)ەکە داناوە و کردوویەتی بە نیشانەی(ڵ) بە کار هاتبێت.

ئەمەی لێرەدا باسم کردووە زیاتر پێوەندیی بە فۆنیمەکان و ئەو نیشانانەوە هەیە کە بۆ نوێنەرایەتی کردنیان لە ڕێنووسی کوردیدا دانراون. بەشێکی دیکەی گرنگی ڕێنووس پێوەندیی بە مۆرفیم و سینتاکسەوە هەیە. ڕاستییەکەی ئەوەیە ڕێنووس یا ڕاستنووسی تا ڕادەیەکی زۆر بەستراوە بە زانین و تێگەیشتنی ڕێزمانەوە. ئەو کەسانەی کە لە سەر هەڵەکانیان دەڕۆن و ناتوانن چارەی بکەن، لەبەر ئەوەیە کە شارەزای ڕێزمانی کوردی نین.

ڕەنگە ئێمە بە تەواوی ئاگاداری ئەو هەوڵدان و ڕیفۆرمانە نەبین کە بە درێژایی مێژووی بە کوردی نووسین کاریان بۆ کرابێت. هەندێ لەو بنەما و نیشانانە لە ڕێگەی دەستنووسە کۆنەکانەوە بە ئێمە گەیشتوون و بە هۆی ئەوانەوە تێگەیشتووین کە کەسانێک هەبوونە بیریان لەوە کردووەتەوە کوردی دەبێ چۆن بنووسرێت. دوای بڵاوبوونەوەی کتێب و ڕۆژنامە بە زمانی کوردی ئیتر وێنەیەکی ڕوونتری ئەو پرۆسێسی ڕیفۆمکارییەمان بۆ ماوەتەوە، وێنەیەکی چاپکراو، کە دەگاتە دەست خەڵکێکی زۆرتر. دواتریش کاتێ لە کوردستانی باشوور زمانی کوردی پلە و ستاتووسی زمانێکی نیوچە ڕەسمیی یا ڕەسمیی وەرگرتووە و کۆمەڵێ گۆڤار و ڕۆژنامەی پێشەنگ بڵاو کراونەتەوە، هەوڵدانەکان چوونەتە چوارچێوەیەکی ڕەسمیی و فراوانترەوە و بنەماکانی ڕێنووس بە شێوەیەکی ڕوونتر ڕۆ نراون، تا دەگاتە ساڵانی دامەزرانی کۆڕی زانیاریی کورد لە بەغدا و چەند دەستگایەکی دیکەی زانستی و فەرهەنگی. لە ئەنجامی ئەو چاکسازی و ڕیفۆرمانەدا ڕێنووسی کوردی لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابوردوودا تا

رادەیەکی باش ڕێکخرا و جێی خۆی گرت و تا ساڵانێکیش دواتر لەناو بەشی هەرە زۆری خوێنەوار و نووسەرو ڕووناکبیرانی کوردستاندا پێڕەویی دەکرا.

لە سەرەتای نەوەدەکانەوە فەرهەنگی کورد و زمانی کوردی و وشەی کوردی پێی نایە سەردەمێکی تازەوە کە لە هەموو ڕوویەکەوە لە ڕابوردووی هەزارساڵەی جیاوازە. لەم سەردەمە تازەیەدا بووین بە ئاشنای ئازادی، بووین بە دۆستی سەربەخۆیی و بووین بە خاوەنی نیشتمانێک، بەڵام زمانەکەمان، زمانی کوردیمان، دۆڕاند و فەرهەنگی کوردمان دزێو کرد و وشەی کوردیمان لە دەست دەرچوو. ئێمە ئەگەر لە تایبەتمەندییە فەرهەنگییەکانی ئەم سەردەمە ورد ببینەوە دەتوانین بە درێژی قسەیان لەسەر بکەین و بە پێی ژمارە و ئامار زۆر شت بڵێین و لێکۆڵینەوە پێشکەش بکەین. ئەگەر بە وردی سرنج بدەین دەبینین ئەمە سەردەمی ڕووخانی فەرهەنگی کورد و هەڵوەشانەوەی زمانی کوردییە. دەکرێ لەم ڕووەیشەوە بە شێوەی جیاواز دیاردەکان بخوێنینەوە و ئەنجامگیریی جۆراوجۆریان لێ هەڵێنجێنین. من ئێستا، لەم نووسینەدا، ئەو هەموو لایەن و دیاردە ناتەندروستانە ناکەمەبابەتی لێکۆڵینەوە و بەراوردکردن، بەڵکە دەمەوێ لە پلەی یەکەمدا باسی ڕێنووس بکەم.

من نازانم لە کوردستانی ئەمڕۆدا ژمارەی گۆڤار و ڕۆژنامە و حەفتەنامە و مانگنامە و وەرزنامەکان چەندە، بەڵام ئەگەر لە بیرم مابێت، لە جێگەیەکدا خوێندمەوە، لە سێسەد بەرەو ژوورە. من نازانم ساڵانە چەند کتێب چاپ دەکرێت، بەڵام بە پێی ژمارەی پەخشخانە و نووسەران و دەنگوباسی ناو ڕۆژنامەکان بێت، دەبێ لە دووهەزار کەمتر نەبێت. لەمانەیش بترازێ ژمارەی ئەو کتێبانەی ساڵانە لە خوێندنگەکاندا، لە سەرەتاییەوە بگرە تا دواناوەندی، و لە زانستگە و پەیمانگەکاندا دەخوێندرێن ناکرێ لە دوومیلیۆن کەمتر بێت. ئێستا ئەم هەموو کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤار و چاپەمەنییە بهێنە پێش چاوی خۆت، ئەوجا بزانە چۆن زمانێکی لاواز و نەخۆش، فەرهەنگێکی سادە و ڕووتوڕەجاڵ و ڕێنووسێکی خوار و گێڕ، وەک چۆن ئاگر بەردەبێتە پووشوپەڵاش، ئاوەها بەربوونەتە ئاوەز و هۆش و بیرەوەری و وزەی داهێنانی مرۆڤی کورد، لە خوێندکارێکی پێنج شەش ساڵانەوە بگرە تا دەگاتە نووسەرێکی حەفتاساڵان.

ئەمە کارەساتێکی نەتەوایەتییە، ئەمە تاعوونێکی فەرهەنگییە و پەتایەکی زمانەوانییە. ئەگەر جاران هەموو دواکەوتنی زمان و هەژاری فەرهەنگی خۆمان دەکردە تاوانی دوژمنان و داگیرکاران، ئەمڕۆ هەموو پاساوێکی ئەم لێقەومانە بیانوو هێناوەیەکی درۆزنانە و هەڵخەڵەتێن و فریودەرانەیە. من گەلێ جار و لە زۆر دەرفەتدا وتوومە و ئێستاش دەیڵێمەوە، بێ ئەوەی ناهەقییەکم کردبێت، ئەمڕۆ لە کوردستاندا یەک تاکە کتێب، یەک تاکە گۆڤار، یەک تاکە

ڕۆژنامە و حەفتەنامە و مانگنامە و وەرزنامە نییە کە بە کوردییەکی ڕاست و ڕێنووسێکی ڕاست نووسرابێت.

من خۆم کە لە ماوەی پانزدە ساڵدا گۆڤاری «مامۆستای کورد»م بڵاو کردەوە، لە سەرەتاوە نا، بەڵام هەر نەبێ لە ناوەڕاستی ئەو ماوەیەدا لەبارەی ڕێنووسەوە کۆمەڵێ ئەنجامگریم لا گەڵاڵە بووبوون کە لە ڕووی زانستەوە دەمتوانی بەرگریان لێ بکەم و بە نووسەرێکی کورد، کە بەرهەمێکی دەنارد لە گۆڤارەکەدا بڵاو بکرێتەوە، بڵێم من ڕێنووسەکە دەستکاری دەکەم و لەگەڵ ڕێنووسی گۆڤارەکەدا دەیگونجێنم. ئێستا ئەگەر تەماشایەکی ژمارەکانی مامۆستای کورد بکەیت، دەبینیت بەرهەم و نامەی زلنا و نووسەرانی گەورە و ناوداری وەک مەسعوود محەمەد، کەمال مەزهەر ئەحمەد، مارف خەزنەدار، محەمەدی مەلا کەریم، سەید محەمەد تاهیر هاشم، شێرکۆ بێکەس و لەتیف هەلمەت و زۆری دیکەیان تێدا بڵاو کراوەتەوە.

کە نووسەرێکی ئەزموونـدار و شارەزا و زمانزان بیەوێ دەست بەو بنەمایانەی ڕێنووسەوە بگرێت، کە لە ئەنجامی ساڵانێکی دوور و درێژی نووسین و لێکۆڵینەوەدا پێیان گەیشتووە، من ڕێزی بۆ دادەنێم کە ئەو لەو ڕووەوە چۆن بیر دەکاتەوە و بە چ شێوەیەک بەرگری لەو بنەمایە دەکات.ئێستە بووە بە نەریتێک کە تەنانەت کۆلکەخوێنەوار و زڕەنووسەرەکانیش خەوش و نەزانیی خۆیان بەوە دەشارنەوە کە گوایە ئەوانیش بیری تایبەتی خۆیان لەبارەی زمانەوە هەیە و ڕێنووسی تایبەتی خۆیان پێڕەویی دەکەن و دەبێ ڕۆژنامەکان ڕێزی ڕێنووسەکانیان بگرن و دەستکاریی نەکەن.

ئەم دەردەیش بەشێکە لەو ئاژاوەیەی دەستگاکانی ڕاگەیاندنی کوردی دروستیان کردووە لە کوردستاندا ئێستا کە زیاتر لە ٣٠٠ ڕۆژنامە و گۆڤار و مانگنامە و وەرزنامە بڵاو دەکرێتەوە، بەڵام بە هەموویانەوە دوو کەسی زمانەوان یا زمانزانیان نییە زمانی ئەو هەزاران وتار و ڕیپۆرتاژ و شیعر و چیرۆک و لێکۆڵینەوانەیان بۆ بکاتە کوردی و ڕێنووسەکەیان بە جۆرێک بۆ ڕاست بکاتەوە کە نەکرێ ڕەخنەی لێ بگیرێت.

قەیرانی ڕێنووس و ئەو سەدان و هەزاران هەڵەیەی لە تێکستێکی ئاساییدا بەرچاو دەکەون هەستێکی والای من، وەک خوێنەرێک و کوردی زانێک، دروست دەکات وەک بڵێی نووسەرەکان دەیانەوێ پلەی وریایی و ژیریی خوێنەر تاقی بکەنەوە و ناچاری بکەن خۆی لوغزی وشە هەڵەکان هەڵبێنێت، یا ناچاری ئەوەی بکەن پەنا بباتە بەر هێزێکی نەپەنی(هێزێکی غەیبی) تا بێت بە هانایانەوە و دەستیان بگرێت و وشە ڕاستەکان بە پەرجوو (موعجیزە)یەک بخاتە مێشک و دڵ و دەروونیانەوە. دیارە منیش دەزانم و خۆشیان، نووسەرانی هەڵەنووس، دەزانن کە مەسەلەکە ئەوەنییە. بەڵام ئەوەی کە ئەوان نایزانن و ناشیانەوێ پێ لە نەزانینەکەی بنێن، ئەوەیە کە ئەوان شارەزای ڕێزمان و ڕێنووسی کوردی نین و ئەو کوردییەی دەینووسن کوردییەکی ڕاست نییە و کوردییەکی هەڵەیە.

ئەنز: سەید یاسین قورەیشی

## «كاریكلماتۆر»

- زۆرن ئەوانەی پێچ و پەنایان هەیە، كورد پێچی هەیە بەڵام پەنای نییە.
- گالیلە! ئاسوودە بنوو، هەم زەوین ئەگەڕێ، هەم مام جەلال بۆتە سەرۆک کۆماری عێراق.
- چۆن ملی بە حەوت تەور نەدەبڕاوە، حاكم لە كوشتنی سەرفینەزەری كرد.
- دەڵێن «دەڵاڵ» بۆتە هۆی گرانی بەڵام بە بڕوای من گرانی واتە نیا تاوانی «دەڵاڵ» نییە.
- ئەوانە كە هەموو پردەكانی پشت سەری خۆیان دەڕووخێنن حەتمەن بۆ گەڕاندنەوە بلیتی فڕۆكەیان كڕیوە.
- مووسیقاژەنەكانی یەک سیم، هەموو بۆ بیستنی یەک ئاهەنگ بانگهێشت دەكەن.
- «پیاوە»تی بكەن با كۆمەڵگایەكی «ژن»سالار ساز كەین.
- یادی بەخێر جاران، حەكیم بە نەخۆشی دەگوت وەرە بتبینم، ئێستا دوكتۆر بە نەخۆش دەڵێ وەرە بمبینە.
- لە عەیبەت شیربایی، خێزانی لەسەر لانک گوێستەوە.
- بۆوەی بە مرۆڤی بناسن لە مافەكەی دەستی كێشا.
- ئەی مردووانی مەوعیزە، لێم گەڕێن گوێم داوە بە مەوعیزەی مردوو.
- هەژار، شەمی جەستەی لەسەر «شەمعەک» داناوە.
- ئەوەی نەیبیستم لەو شارە، هەر ئەقلی چۆلەكەیە و منارە، نەگونجاوە، بەڵام باوە.
- یادی بەخێر جاران، لە خۆشی جێژن پڵاومان دەخوارد، ئێستا لە خۆشی پڵاو جێژن دەكەین.
- ڕۆژەكان، چەند پاتەم دەكەنەوە و من كاتەكان ئەجاوم بێشیرنایی.
- ئەی خەڵكی شارە بەردینە، ڕێی سەرزەوینی سەوزی منالیم كوێنە؟
- «مەرگ بەر كورتان، مەرگ بەر كورتان» بیورێن كەر شۆخی نازانێ.
- شووڕا، سووڕا، شارەدارەكان دەست لە ئانتێنەكانی خۆیان نەدەن.
- بۆ هەر ناتێ دەبێ وردكەینەوە پارەی گیانمان؟
- لە شەقامەكان، «شەق»، «قام» ئەخوێنێ.
- پاشا بەرگی نوێی لێ مەبارەک بێ، ڕەعییەت هەموو بێبەرگن.
- ئەوانەی قسەی خۆیان دەخۆنەوە، كاوێژ دەكەن.
- كورد بە پێنووسەكەی خۆی دەكرێتەوە، بەڵام پێنووسەكەی نافرۆشێ.
- ژیان، عومرێ جاونانەوەیە، بۆ چەند گەز.

- ئێرە ئەوار فرۆشیی مامۆستا حەسەن زیرەکە؟ بێ زەحمەت ئەوارێکی مایکل جاکسۆنمان دەنێ!

- ماشەللا خێزانداران! بابت ئەو هەموو سوغرا و کوبرایە ی بۆ چییە؟ دەیهەوێ چ بسەلمێنێ.

- ئەوانەی قوونی حیماسەیان نییە، نازانن خوێن چ ڕەنگە.

- ئاشا ئێمە بووینەتە میوانی کێ! دەڵێی ئەومندااڵانە کەمێ بەو لۆستیرانە جۆلانێ بکەن دەیخۆن.

## شیعریکی تەنز: سەید یاسین قورەیشی

### «چێشتە قولە»

لە دەرکی لە نجومەن، ژێر دەستی یاوان    دەرم هێنا، دەگریا چەشنی باران
وتم تۆ شاعیری بۆ چ وا شپرزەی    وتی چ بکەم لە دەست نەقدی نەیاران

★

لەمڕۆکە لە عەسری ئیرتباتات    پێت وایە بێ سەمەرە تەبلیغات
دیتوونە سەرفەجوویی خات بەسێ    چون کورتە دامەنی دەست پێی ناگات

★

مەسەلی قیمەتفڕینی چەشنی دالە    تەموەرووم هەر وەکوو دولپایە زالە
کە دەدری گوڵی قیمەت رۆژێ چەند جار    وەرینی دیڵی مووچە، سال بە سالە

★

زمان فێر بە و لێتر پیری وەلا نێ    هەوالی بوو بۆ هەر رۆژنامەخانێ
وتم پێژی بە فێر بوونی نەبم پیر    وتی پیر بووی، تو خوا ئەو مەکرە دانێ

★

وەرە ساقی تۆ خوا مەردی خودا بە    لوتف کە پیالەیە، لەو مەیەنا بە
مەگەر ناوا فەراموش کەم خەمی ناو    کە نرخی ناوی مەشروب وەک شەرابە

★

دڵم خۆش بوو وتم دێ ئیرتیباتات    بۆ پێوەندی لە هەر کات و لە هەر سات
موبایلیش ئێی بڕی، چەشنی مبالە    موبایلیان نەگوتووە بۆ بێ موبالات

★

سەر ڕێگامان هەڵڕژاوە، سەت مەوادی دوود و دەم    قاتلن بومەی جەوان، خومن لەگەڵ ڕای ئێوە هەم
ژێر سەری بێکارییە، من گشت هەڵەو تاوانەکەم    ئێشی تر گەر شک نەبەن، باوانەکەم باوانەکەم

★

چاوی پڕ لە قورمی ڕەش، پشت چاوی شەدەی مۆرە    دەمی دەنێتە کەلاک، نێتوکیشی بەو جورە
تەختی دەم و چاو سپی، ئەولاتریشی بورە    خەتێ لە دەوری لێوی، دەیکا بەسیکەتورە

★

لە چەند سوپێر بسێنم کەل و پەلی رۆژانە    شت و مەکی واگران، بە ئەو حوقوقە جوانە
لە هەر کامیان کە بکڕی، ماکارۆنی یا ڕشتە    لای ئەوی دی بوویەتە، دوژمنی بابە کوشتە

★

هێندێ پیاوی وا هەیە، لە مال دەکا بولەبول    لە دەرێ شاد و شەنگول، وەکوو لوتیی عەنەدول
خوی حەشاردەدا دایم، لە پەناو پەسوێ، لە چول    چاو دەگێڕێ وەکوو مار، بو پووزیکی سپی و سول

★

ئەم سالیشی بە سەر برد، بە بەرەللایی ولاتی    دەرزی بو نەخویندرا، ڕوژێ لە عیشقی فاتی
پێی وایە تەقەلوویە، تەنیا ڕێگەی نەجاتی    کور لێت دەبێ بە دوژمن، کاتێ کە بێ نەهاتی

خالید ئەحمەدی

**کۆلکە زێرینە** (شیعر بۆ منداڵان)

پەلکە زێرینە
جوانە، نەخشینە
وەرزەکەی بەهار
هەستە بیبینە
ئەو بە وێنەی گوڵ
چەندە ڕەنگینە
زەرد و نیلی و سوور
کەسکە یا شینە
چاو لە ئاسۆکە
کۆلکە زێرینە
وا بەهاری گەش
چاوەڕێی زینە

***

گیاندارێکی کوێستانم
دەڵێی ئاورە ددانم
چاوم پرووش و چووکە
بەژنم خڕ و بە تووکە
زستان لە ناو ئەشکەوتم
کارم بەهار هەڵدەستم
لە شوێن تەماڵ ناوەستم
ڕەنگم جوانە قاوەییم
مەنشوورە دۆستایەتیم
پێم دەڵێن دۆستی ئەزان
ناوم هەڵدە بەرخە گیان

نووسەر: موحسین هیجری
وەرگێر: ئەمین گەردیگلانی

## «توانایی منداڵی لە پێگەی بەرەدەنگی ئەدەبیدا»

### سەلماندنی وزەی جوانی ناسیی منداڵی لە دەزگای ناسیاریی«کانت»دا

قەبووڵ کردنی ئەو بابەتەی کە منداڵی دەتوانێ بێتە بەر دەنگی وێژە، ڕەنگە لە هەموو شتێک زیاتر، لە هەوڵی وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارەدا بێ کە منداڵ دەتوانێ بێتە بەردەنگی وێژە و توانایی. ئەوەی هەیە کە حوکمی جوانی نلسانە دەرکا، ئەی بلێی بتوانێ کاتی بەرەوڕوو بوون لەگەڵ دەقێک لە باری جوانی ناسیەکەی بگا و «کانت»[1]، گوتەنی حوکمی سەلیقەیی دەرکا یان نا؟ ئەگەر ئەو تواناییەی منداڵ بە لامانەوە پەسەندە و بە سەرنجدان بە نەبوونی ئەو ئاوەزە جیاوازەی لای ئەو[2]، دەکرێ بڕوا بەو هۆگرییەی بکەین و دەتوانین ئەو لە پێگەی بەردەنگێکی چالاک دانێین کە لە توانایدا هەیە و هێڵی سوور لە نێوان جوانی و ناحەزییەکاندا بکێشێ. پرسیاری دواییش ئەوەیە کە بیری منداڵ کاتی دەرکردنی حوکمی جوانی ناسیانە، لەگەڵ بەردەنگی گەورە جیاوازیی تەواوی هەبێ، یان بە بۆچوونێکیتر لە هێندێ پازەوە کەموکووڕیی هەیە؟ یان نا، بە پێچەوانە دەتوانین ئەو لە بەردەنگی گەورە بە چاکتر بزانین و قەبووڵی بکەین ئەو ڕادەی تێگەیشتنی لە دەقێکی جوانی ناسانە زیاترە لە گەورە.

وەڵامی ئەو پرسیارانە، لەو بابەتەوە گرینگە کە لە ڕوانگەی بڕێک لە خاوەن ڕایانی وێژەی منداڵەوە، لە پێک گرتنی تایبەتمەندییەکانی بەردەنگ لەگەڵ ئەو نوێنەرە جوانی ناسیانەی لە دەقی وێژە پەیدا هەیە کەمتر سوودیان لێوەردەگیرێ. هەر بەو هۆیەش وێژەی منداڵ زیاتر ئاوڕ لە دەقە فێرکارییەکان دەداتەوە و بە بۆچوونێکیتر خۆ لە قەرەی وێژەیەکی بێخەوش[3]

---

١- ئیمانوئیل کانت *immanuel kant* ( ١٧٢٤- ١٨٠٤)

٢- گیرسانی نمانا لە منداڵاندا، یان play,dreams and imitation childhood ژان پیاژە وەرگێرانی زینەت تەوفیق، ٢٠٠٢

٣- مەبەست لە وێژەی پەتی و بێخەوش بەستێنێکە کە لەودا چێژی ئەدەبی لە سەروو هەموو واتایەکی ترەوە و تەنانەت لە فێر کردن و پەروەردەش باشترە.

نادا. هێندێکی‌تر پێیان وایە بەردەنگی وێژە دەبێ توانایی دەرکردنی حوکمی جوانی ناسیانەی هەبێ. بەڵام منداڵ بە هۆی نەبوونی ئاوەزی جیاواز لەو چەشنە توانایییە بێ بەشەو هەر بەو هۆیەشەوە دەقی ئەدەب بۆ منداڵ خۆ لە قەرەی جۆرێک پاشکەوتوویی، یان دا چوونی ناچاری دەدا و ڕەنگە هەر لەو ڕوانگەیەشەوە بێ کە بڕێک کەس وێژەی منداڵان بە شێوەیەکی ناتەواو و نیوەچڵی وێژەی گەوران دەزانن و بۆ نووسەرانی ئەو بوارە سەرکەوتنی زیاتر لە زانری وێژەی گەوراندا بە ئاوات دەخوازن!

ئێمە لەم نووسراوەیەدا بە سوود وەرگرتن لە ڕوانگەی «کانت» لە چۆنیەتی دەرکردنی حوکمی جوانی ناسیانەدا، یان بە بۆچوونێکی‌تر حوکمی سەلیقەیی ئاماژە بەو بابەتە دەکەین. کە بە نەبوونی ئاوەزی جیاواز توانایی منداڵ لە دەرکردنی حوکمێکی ئەوتۆدا نافەوتێ و هەر بەو هۆیەش نابێ پێمان وابێ کە وێژەی منداڵ بە هۆی نەبوونی لێهاتوویی بەردەنگی تایبەتی خۆی، کەمتر سوود لە تایبەتمەندییەکانی جوانی ناسی وەردەگرێ. تەنانەت ئەگەر ئەو بابەتەشمان بە دڵ بێ کە بە هۆی سنووردار بوونی چوارچێوەی وشە و فامی منداڵ، دەبێ دەقی وێژەیی پابەندی بەردەنگ بێ، دەبێ بپرسین کام دەقی وێژەیی گەوران هەیە کە بە بێ سەرنجدانی بە سنووردار بوونی بەردەنگەکەی گووراوە و نووسەرێک کە زمانێکی تایبەت بۆ نوسین هەڵدەبژێرێ، ناتوانین بڵێین بە شێوەیەکی سروشتی خۆی بە تایبەتمەندیی زمانی و تێگەیشتنی تاقمێک لە بەردەنگەکانیەوە بەستوتەوە؟

## (گریمانە نەسەلمێندراوەکان)

«ئێمە هەر لە منداڵییەوە بیر و باوەڕێکمان سەبارەت بە عەداڵەت و جوانی هەیە کە شوێنی ئەوان لەسەر پەروەردە بوونی ڕۆح، وەک شوێن دانانی دایک و باوک وایە و ئێمەش خوومان بەوە گرتووە کە ڕێزی بۆ دانێین.[4]»

---

٤- کۆماری ئەفلاتوون، وەرگێرانی فوئاد ڕۆحانی. پەخشانگەی زانستی و فەرهەنگی ٢٠٠١

جگە لە ئەفلاتوون کەسانێکی تریش وەک رۆسۆ[5] هۆگری منداڵی بەو نیشاندەرە جوانی ناسانەیە بە شتێکی زاتی[6] دەزانن. بەڵام ئەم هۆگرییە بە جوانیناسی، یان بە بۆچوونێکی گشتی‌تر، شتی جوان چ پێوەندییەکی لەگەڵ سیستەمی فیکریی منداڵ هەیە. لەو چەشنە گریمانەیەدا وەڵامێکی دڵنیاکەرانە نادۆزینەوە و ئەگەر بۆچوونی پیاژە لە تەمسیلێکدا وەک خوێندنەوەی بیرۆکەی منداڵ چاولێکەین و قەبووڵمان بێ و ئەگەریمان وابێ هەمیشە خەریکی پێک‌گرتنی وردەکاریەکانە، کە وایە ئەو چۆن دەتوانێ بچێتە نێو دۆزێکی وەک ئەدەبیاتەوە کە لەودا درگای مەجاز و خوازە و کینایە و ئامارە ئاواڵەیە و هەموو شتێک تەنانەت راستەقینەش لە پانتایەکی جیاواز و بەرچاودا هەست پێدەکرێ.

لێرەدا بە پەیرەوی لە فرۆید[7] ئەگەر قەبووڵمان بێ کە هۆگری بە هونەر، بە هۆی نەستی خنکێندراوەوەیە یان بە دۆزواز بوون لەگەڵ یونگ[8] بڵێین کە نەستێکی هەمووانی، ئێمە بەرەو ئەو لایە ڕێنوێنی دەکا، یان ئەوەی کە وەکوو شوێن‌کەوتوودانی ڕێبازی دزەی هەستەوەری[9] بەو شێوەیە بەڵگە بێنینەوە کە مرۆڤ کاتی دیتنی راستەقینەی هەست‌پێکراو، دەرگای زەینی ئاوەڵا دەکا بۆیان و بە هۆی هەستی ئەوەوە ئەو شتانە دەبیندرێن، بە هەر شێوەیەک بێ زۆربەی مەسەلە نەسەلمێندراوەکان دەستیان لێهەڵدەگیرێ و ویژەی منداڵان لە پاڵەوپشتێکی فەلسەفی بێبەش دەبێ. لە ڕاستیدا ئێمە بە سەلماندنی فەلسەفیانەی توانایی منداڵ لە تێگەیشتنی جوانی، بەو باوەڕە دەگەین کە لێوەشاوەیی زاتیی بەردەنگی ویژەی منداڵان باشە و ئەم گرینگایەتییە لە دەست ئەم هەوڵانە نایە کە ئامازەمان بە بڕێکیان کرد.

---

٥- ئەمیل، ژان‌ژاک رۆسۆ، وەرگێرانی غولامحوسێن زیرەکزادە و بەخشانگەی ناهید،٢٠٠٣

٦- مورتەزا موتەههەری زات وەک سروشت و خوماک بە شتێکی گوورلو دەزانێ؛ بەو جیاوازییەوە کە زات لە خوماک ئاگاترە. زات، لاپەڕەی ٣٣ بەخشانگەی سەدرا ٢٠٠٥

٧- ئاماژە بە دەخەزی نووسەر کە لە ئەندێشەی فرۆیدا کار و کاردانەوەی مرۆڤ لە منداڵییەوە هەتا پیری دەخاتە ژێر کاریگەریی خۆی.

٨- جوانیناسی بە زمانێکی سادە. مەحموود عیبادیان، لاپەڕەی ٤١، ئەلومەندی زانیاری و لێکۆڵینەوەی هونەری ٢٠٠١

٩- ڕێبازی دزەی هەستەوەری، چەمکێک لە ڕەوانناسی خۆ ڕاوانانە، یان introspeclive دێتە ئەژمار.

## (بەردەنگی وێژەی منداڵان لە ڕوانگەی کانتەوە)

بە سەرنجدان بە وتەکانی کانت کە سەبارەت بە سەلماندنی هۆگری مرۆڤ بۆ جوانی، بە دۆز و دەرەنجامێکی باش دەگا و لە دەپشێکی باسکراوەدا، ئاکامێکی باش بە دەستەوە دەدا، هەر بۆیە بە باشی دەزانین کە بە کەڵک وەرگرتن لە جوانیناسیی کانتی، پێگەی منداڵ وەک بەردەنگی ئەدەبیات زەق کەینەوە؛ بە تایبەت ئەوەی دەسکەوتەکانی کانت لەگەڵ تیۆرییەکانی نێو ڕەوانناسی منداڵیش سازگارە.

کانت دەڵێ: «لە بەرەوڕوو بوونەوەی مرۆڤ لەگەڵ سروشتدا، مرۆڤ هەوڵ دەدا جۆرێک هاوڵێکی لە نێوان ناسیاریی خۆی و دیاردەکانی بەرامبەریدا دروست بکا؛ بە جۆرێک کە پرژوبڵاویی جیهانی دەرەوە لە ئەندێشەی خۆیدا کۆکاتەوە و هەموویان بخاتە ژێر فەرمانی یاساوڕێسای گشتیی خۆیەوە. کاتێک ئەو هاوڵێکییە پێک دێ، هەست بە چێژێکی خۆش دەکا چونکە وا هەست دەکا کە لە سروشتدا، ئامانجداری هەیە و ئەویش توانیویەتی تێیبگا، بەڵام کاتێک لەگەڵ منالێک بەرەوڕوو دەبێ هەست بە وەڕەزی دەکا.[10]»

کانت لەسەر ئەو باوەڕەیە کە هەست کردن بە چێژ و ئازار، ئەگەرچی بەشێک لە سیستەمی ناسیاریی ئێمە نین، بەڵام پێوەندییەکی بەردەوامیان لەگەڵیدا هەیە. ئامانجداریی دیاردەکانیش شتێکی هەست پێکراو و لەبەرچاو نییە، بەڵکوو چەمکێکە کە ئێمە بە دوایدا دەگەڕێین و لە هەمبەر دیاردەی ناسیاریدا شتێکی ڕواڵەتییە و وەک چێژ و ئازار ناتوانین بە بەشێک لە سیستەمی ناسیارییان دانێین. لەو حاڵەتەدا مرۆڤ کاتێک سروشت بە ئامانجدار دەزانێ کە بۆچوونی ئەو بۆ شناس هاوڕێ لەگەڵ چێژ بێ و ئەو بۆچوونە خۆشی، بۆچوونێکی جوانی ناسانە لە ئامانجدار بوون بێ.

بە بڕوای کانت، زەین کاتی ڕووبەڕوو بوون لەگەڵ ئامانجداری دیاردەیەکە، بێتەوەی بیهەوێ لەگەڵ چێژ ئاوێتە دەبێ و لەو کاتەدایە کە ئەو دیاردەیە بە جوان دەزانین. بە واتایەکی‌تر چێژی

---

١٠- ڕەخنەی وزەی حوکم، ئیمانوئێل کانت، وەرگێڕانی عەبدوولکەریم ڕەشیدیان، بەخشانگەی ٢٠٠٧

نائاگایانەی ئێمە لە ئامانجداریی دیاردەیەک، پێمان دەسەلمێنێ کە بە جوانی بزانین. کانت ئەو حوکمەی کە دەبێتە هۆی چێژێکی ئەوتۆ، بە حوکمێکی سەلیقەیی دەزانێ. ئەگەر ئەوەی کانت دەیڵێ بە گریمانەی بزانین؛ ئەو کاتە تێدەگەین کە بۆچی منداڵ سەرەڕای کەم‌وکووڕیی دەزگای ناسیاری و نەبوونی ئاوەزمەندیی جیاواز، حوکمی جوانی ناسیانە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست دەردەکا و لەو چوارچێوەیەدا، نەک جیاوازیی لەگەڵ گەوران نییە، بەڵکوو چونکە واتای جیاواز نابێتە مێنملوملۆزمیان تا ڕادەیەکی زۆر لە مەترسی بە دوورن. لەگەڵ ئەوەی تووشی جوانی دەبن لەمڕیوە تێیدەگەن و دەبنە هۆگری. بەوەدا کە کانت ئاوا بە باشی بەڵگە دێنێتەوە بۆمان دەردەکەوێ کە حوکمی(سەلیقەیی) لە ڕووی ئەزموون و بارستایی ئەوەوە نییە، هەر بۆیە نەبوونی ئەزموونی منداڵیش ناتوانێ ببێتە کۆسپێک لەسەر ڕێی دەرکردنی حوکمی جوانیناسی.

**(هاوڕێژەیی حوکمی سەلیقەیی لەگەڵ ئەندێشەی تەمیسلیی منداڵ)** خاڵێک کە زۆر گرینگ و شیاوی ئەوەیە هەڵوێستی لەسەر بکرێ، هاوڕێژەیی حوکمی سەلیقەیی لەگەڵ ئەندێشەی تەمسیلیی منداڵە کە بەرلەوە بە ئاماژە کردن بە بواری دەروونناسی، ئاوڕمان لێدایەوە، لە ڕوانگەی کانتەوە حوکمی سەلیقەیی یان دەستنیشان کردنی باری جوانی، کاتێک مسۆگەر دەبێ کە زەین لەگەڵ دیاردەیەکی پاژەکی بەرەوڕوو بێ و پاشان بیگەڕێنێتەوە بۆ ماکی ئامانجداری کە لە زەیندا نیشتەجێیە. کانت لەسەر ئەو باوەڕەیە کە بۆ بڕینی دیاردەیەکی پڕ دەستکەوت پێویست ناکا زەین بە دوای یاسایەکی گشتیدا بگەڕێ؛ چونکە بەر لەوە ئەم ئامانجدارییەی وەک بنەما و ماکێکی گشتی قەبووڵ کردووە، هەر بۆیە لەگەڵ دیتنی دیاردەیەکی ئامانجدار بواری دەرکردنی حوکمی سەلیقەی بۆ دەڕەخسێ. چونکە بە شێوەیەکی نائاگایانە بابەتی پاژەگی بۆ قاعیدەی گشتی، یانی ئامانجداری دەگێڕدرێتەوە و بەم شێوەیە حوکمی سەلیقەیی دەردەکرێ کە ڕاست ئەو دیاردەیەیە وا مەبەستی ئێوەیە.

کە وابوو ئەندێشەی تەمسیلی منداڵ کە تەنیا لەگەڵ پاژەکان هەڵسوکەوت دەکا و دەرەقەتی جیاوازیی واتا گشتییەکان نایەت، بۆ دەرکردنی حوکمی سەلیقەیی سەبارەت بە واتای جوانی لەگەڵ هیچ کۆسپێک بەرەوڕوو نابێ و بەم شێوەیە دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە بۆچی

منداڵ بەر لە گەیشتن بە تێگەیشتنی جیاوازی توانایی دەرکردنی حوکمی جوانی ناسانەی هەیە و داوەری ئەو سەبارەت بە واتای جوانی، نەک بایەخی بەقەد داوەریی گەوران نییە، بەڵکوو بە هۆی نەبوونی دەخەزداری و بەرژەوەندخوازی، زیاتر لەگەڵ پاکی و ڕاستی ئاوێتەیە. توانایی منداڵ بۆ دەرکردنی حوکمی سەلیقەیی، چۆنیەتیی بەرەوڕوو بوونەوەی وزەی ئەو لە بەستێنی وێژە و هونەردا بە جوانی شی دەکاتەوە. چونکە لەو بەستێنەدا پێوەندی دانی پاژەکان لەگەڵ ئەسڵێکی ئامانجداردا کە ماکی حوکمە جوانیناسییەکانە، قسەی هەوڵ دەکا. کە وایە لە لایەنی جوانیناساوە، وێژەی منداڵان لەگەڵ بەردەنگێکی بێ توانا بەرەوڕوو نییە و تووشی بەربەست نابێ و ئەگەر نووسەر خوازیاری ئەوە بێ کە واتای جوانیناسانە لە دەقەکەیدا بێنێ، لە لایەن منداڵەوە هیچ کۆسپێکی بۆ نایەتە پێشێ. تەنانەت دەتوانین لەسەر ئەوە پێداگری بکەین کە سەرەکیترین بەردەنگی وێژە و ئەدەب منداڵانن؛ چونکە تێگەیشتنی جوانیناسیی ئەو لە مەترسیی دەستەبەندیی زەینیدا نییە و ئەو بە سانایی دەتوانێ بە بێئەوەی بچێتە ژێر باری دەسەڵاتی واتا گشتییەکان، جوانی بدۆزێتەوە و شاتوشووتیش نییە ئەگەر بڵێین بەردەنگی گەورەی ئەدەبیاتیش لە حاڵی گەڕانەوەدایە بەرەو باروودۆخێکی وا کە چێژی وێژەیی بدۆزێتەوە؛ چونکە ئەگەر ئاوەز هەڵگرێتەوە بۆ سەر ئاکام و بەرژەوەندیی دەسەڵاتدار بێ (یانی هەر ئەوشتەی کە پێداویستیی ژیانی ئاوەزمەندە). چوون بۆ نێو جیهانێک کە تەنیا لە دەرەوەی خەیاڵەوە بەردەنگ دەدۆزێتەوە، بە هیچ کلۆجێ نالوێ.

سەرچاوە: پژوهشنامەی ادبیات کودک و نوجوان شمارە ۵۱، ۱۳۸۶ تهران.

فەرهەنگۆک:

پاژەکی: جزئی

پەخشانگە: انتشارات

ئامانجدار: هدفمند

منالتەوەر: کودک محور

دزەی هەستەوەری: رسوخ حسی

بەردەنگ: مخاطب

ویژە: ادبیات

ملۆزم: مزاحم

مێمل: مزاحم

هاوڕیژەیی: تناسب

دەستەبەندی: طبقەبندی

نمانا:نماد

گیرشان: شکل گیری

خۆماک: غریزە

گووران: تکوین

دەخەز: عُقدە

خۆڕوانانە: خودنگرانە

****

## بای وادە

ئـەی بـادی سـەبـا ڕەببی بـەخێـر بێـی ئـەوە هـاتی
پـەردەت وەسـەمـا خسـتووە بـای خۆشـی نـەجـاتی
مـەشـهوورە دەڵـێن بـەینی شـەوێ و کـاتی بـەیـان دێـی
دوێنـێ کـە درەنـگ هـاتی، نـەهـاتی بـوو نـەهـاتی
نـازداری سـەبـا خـەوتـووە ئامانـە بـە نـەرمـی
تـۆ خـودا کـە مـوازب بی، خشـە و چرپـەیـی پـاتی
هێشـتا گوڵـەکـەی ئێمـە لـە خـەو ڕانـەچـەنیـوە
تونـد تێنـەپـەڕی نامـەکـە، تـۆ گیـانی بـراتی
بـا هـەر دوو پێکـەوە هـاوڕازی سـەفـەر بـین
تـۆ چـاوی بـرای شـاعیری خـۆش زەوقـی سـەباتی
بـاوەڕ مـەکـە هـەر جووتـێ بـەیـت دێـت و بـەیـان بێ
شـەو مـورغی شـەواویـژ و سـەحـەر سـەردەم و سـاتی
هـەرچـەنـدە کـە وا تۆبـەیـی زاهیـد دەشـکێنێ
ئـەمڕۆکـە لـە چـاو دوێکـە بـە نـەسـپایی و مـاتی
سـەد جـار بـە فیـدای شـەوگـەڕی شـەوکـاتی شـەویـتم
ڕەحمـەت لـەوە بـەم نـاوی سـەبـای خۆشـەوە نـاتی

بۆکان- ١٣٨٤/٥/٢٩

## ژیانەوە

جەفای تاقەت پڕووکێنی ئەگەرچی خۆ چەمانمێوە
دڵم زاماری تیری بوو هەزار جاریش کوڵانمێوە
دەڵێن فەرموویەتی پیرە کە وایە، بێ دەسم بگرێ
لە بۆ من فەخرە گەرچی ئەو بە وێنەی شەم توانمێوە
ئەمن پیری جەفا و جەووم نەوەک پیری تەمەن، گیانە
دەزانی سەردەمێکی زۆر بە دەم دەردەو تلانمێوە
لەمێژە چاو لە ڕێگا بووم بنێری مەرهەمی دەردەم
گەیشت پەیغامەکەت گیانم بە گیانی تۆ گەشانمێوە
بە چەشنێ تاسەباری بووم کە ئەو ڕازە بدرکێنێ
منەتباری پەیامی تۆم لە دەست مەینەت حەسانمێوە
بە قوربانی شەماڵ سەدجار هەواڵی خۆشی بۆ هێنام
بە شاباڵی خەیاڵ دیسان بەرەو بەرزی فڕانمێوە
لە بێمەیلی گوڵی ڕووی تۆ دڵی «شوان» سیس و ژاکابوو
بە قوربانی وەفا و مەیلت وەکوو چیمەن ژیانمێوە

***

## چەغزی ئەوین

بەرەو پیری دەچووم فەرمووی ئەتۆ پیری بڕۆ لاچۆ
لە سەر ئێوارەیە لاقت بە ناخی گۆڕی تەنگاچۆ
وتم پیرەوکەیە دڵ گوڵ وەرە تۆ دارە دارەم کە
وەیا دەستم گرە و یاخۆ لە ژێر داری قەنارەم کە
بە تاڵی زوڵفەکانی خۆت دڵم هەڵواسە با بەس بێ
هەناسەی پڕ لە تاسەی دڵ بە یادی چاوەکەی مەس بێ
لە سۆزی سازەکەی سینەم وەرە گوێ بگرە بۆ ساتێ
هەوای گیان گیانەکەم دەچڕێ بە یادی تۆوە هەر کاتێ
گوڵی شەنگم دڵی تەنگم دەوامی دووری ناهێنێ

بە بێ مەیلی گوڵی هیوا دڵ و گیانم دەسووتێنێ
دەبێ سارێژ بڕینی من، دڵ و گیانم بە قوربانت
ئەوا هات دارە دارە ‹شوانە› لە بۆ ئەمری لە دار دانت
نموونەی بەرزی یەزدانی، بە نەرمی کاتێ دەڕوانێ
دەمێ پەنجەی شەفابەخشت لە سەر زامی دڵم دانێ
بە دڵ جاڕز بووە ئێژێ هەچی گوڵ بێژێ هەر خۆشە
بەڵام واتێنەگەی بێژی نەزانە و کەللەکەی بۆشە
لە دیمەنتا هەزاران وەسف نەکەم هەر یەک بە جۆرێکی
سەرنجم ڕاوچی خاڵی تۆ بە وێنەی گۆڕ و پۆڕێکی
عەجەب ڕاوی دڵم دیلە لە ناو جەغزی ئەوینێکە
بە کاخی شاهی قەت نادەم سزای ئەو جەغزە ژینێکە
موبارەک بێ لە من گێژم لە گێژی گێژەوەی خەمدا
خەڵاتی بەرزی دڵدارە لە ڕیزی باشی بەرهەمدا
بدە زاخاوی دڵ تاکوو دەبێ بۆت خالیس و موخلیس
ئەگەر مردیش لە خزمەتتا دڵم چەشنی گوڵێکی سیس
لە تەرمی نەرمی بڕوانی سەرنجی دەی بە ئەسپایی
شنەی مەیلت بە سەریا بێ دەکەی کاری مەسیحایی
گەلێ شانازییە ‹شوانە› ئەوینێ پاک و بێ خەش بێ
گوڵی سیس هەڵگەڕاوی دڵ بە سروەی مەیلەکەی گەش بێ

## ڕێوڕەسمی کۆتایی

## خولەکانی فێرکاریی زمانی کوردی و ئەدەبیی منداڵان

ڕێوڕەسمی کۆتایی ٥ خولی فێرکاریی (٣ خولی سەرەتایی، خولێکی لاتین و خولێکی تەکمیلی) لە کاتژمێری چواری پاش‌نیوەڕۆی ڕۆژی پێنج‌شەممە ڕێکەوتی ١٣٨٩/٧/٨ بە ئامادە بوونی دەستەیەک لە شاعیران، نووسەران، وەرگێڕان، هونەرمەندان و هۆگرانی فەرهەنگ و ئەدەب و ئەندامانی کۆڕی فێرکاری و فەرهەنگیی ئەدەب و ئەدەبدۆستانی: بۆکان، مەهاباد و سنە لە هۆڵی: «فەرهەنگسەرای سیمورغ»ی ئیدارەی فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی بۆکان بەم جۆرەی خوارەوە بەڕێوە چوو:

- خوێندنەوەی چەند ئایەت لە قورئانی پیرۆز لە لایەن کاک شێرکۆ سالحی‌ڕاد.
- دەسپێکی بەرنامە و بەخێر هێنانی ئامادەبوان لە لایەن کارگێڕی بەرنامە سەیدیاسین قورەیشی.
- بەخێرهێنان و کورتە ڕاپۆرتێک لەبارەی کار و چالاکییەکانی کۆڕی فێرکاری و فەرهەنگیی ئەدەب لە بواری فێرکاریی زمان و ئەدەبی کوردی و ئەدەبیاتی منداڵان لە لایەن کاک مستەفا ئیلخانی‌زادە بەرپرسی کۆڕی فێرکاری و فەرهەنگیی ئەدەب.
- وتاری بەڕێز کاک ڕەزا عەبباسی بەرپرسی ئیدارەی فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی بۆکان لەبارەی کار و چالاکی و بەرنامەکانی داهاتووی ئەو ئیدارەیە.
- وتار لە لایەن مامۆستای ئایینی مەلا جەلال مەولوودپووری.
- وتارێک لە ژێر سەردێڕی زمان و هوویەت لە لایەن کاک یونس ڕەزایی.
- وتارێک لە بارەی ڕۆمانی کوردی لە چەند ساڵی ڕابردوودا لە لایەن کاک حوسێن شێربەگی.

- وتاریک بە ناوی ئاشنایی لەگەڵ ئەدەبیاتی منداڵان لە لایەن خانم لەیلا ساڵحی مامۆستای خولی فێرکاریی ئەدەبیاتی منداڵانی کۆڕی فێرکاری و فەرهەنگیی ئەدەب.
- وتاریک بە تەسەلی لە بارەی کار و چالاکییەکانی چەند ساڵەی کۆڕی فێرکاری و فەرهەنگیی ئەدەب لە لایەن کاک خالید عەسکەری ئەندامی کۆڕی فێرکاریی فەرهەنگیی ئەدەب.
- وتاریک لە بارەی زمانی زگماکییەوە لە لایەن خانم فەوزیە قورەیشی.
- نایە ژەنیی لە لایەن هونەرمەند عوسمان محەممەدی(عوسمانە سوور).
- ڕوون کردنەوەیەک لەبارەی نەقشەی وێنەداری گەشت و گوزاری و فەرهەنگیی شاری بۆکان و ئاماژەیەک بە پرۆژەکانی داهاتووی «شیرکەتی موهەندسینی مشاویری سنووری هیوای میدیا» لە لایەن کاک مەنووچیهر جیهانی.
- سپاس کردنی ئەو کەسانەی بەشداریی ئامادە کردنی خەریتەی وێنەداری گەشت و گوزاری و فەرهەنگیی شاری بۆکانیان کردووە لە لایەن موهەندیس شۆڕش خالیدی.
- خوێندنەوەی شیعر لە لایەن: موهەندیس شۆڕش خالیدی، ئالا گوڵمحەممەدی، هیوا گوڵمحەممەدی، ئامینە چاک، هێمن گەردیگلانی، کیان قورەیشی، سووسەن حەسەنزادە، ئاریا بوداغی، سیروان نیکزاد، ئارەزوو سادقی، چرۆ بوداغی، ئیلهام محەممەدی، محەممەد ئەسەدی، سانا مەولوودی، هەژار حەسەنزادە، باران خزری‌نەقدەم. دەبێ ئاماژە بکەین لە خڕ کردنەوە و ئامادە کردنی ئەو منداڵانەی شیعریان خوێندەوە کاک ئەمین گەردیگلانی زەحمەتێکی زۆریان کێشابوو. شایانی باسە بە باش‌ترین خوێندکارانی پلەی یەکەم تا سێیەمی ئەدەبیاتی منداڵان و مێرمنداڵان خەڵاتی نەغدی پێشکەش کراو بە هەمووی ئەو خوێندکارانەی کە لە خولی ئەدەبیاتی منداڵان و پێنج خولی موقەددەماتی و لاتین و تەکمیلی کوردی لە تاقیکاریدا بەشدارییان کردبوو و لە ئەزموونی ئەو خولانەدا دەرچوویوون بڕوانامە و نەقشەی وێنەداری گەردشگەری و فەرهەنگیی بۆکان درا. بە مامۆستایانی ئەم خولە فێرکارییانە کە بریتی بوون لە خانم لەیلا ساڵحی مامۆستای وانەوێژی ئەدەبیاتی منداڵان و خانم کوردستان مەلامەحموودی و خانم سووسەن حەسەنزادە، ئاغایان سیامەند بەخت‌ئازەر و ڕەحیم

عەبدوررەحیمزادە مامۆستایانی خولەکانی فێرکاریی زمان و ئەدەبیاتی کوردی ڕێزنامە و نەقشە پێشکەش کرا. بودجەی ۲۰ دانەی ئەو نەقشانە لە لایەن کۆڕی فێرکاری و فەرهەنگیی ئەدەب دابین کرابوو و ٦۰ نەقشەش لە لایەن شیرکەتی موهەندسینی موشاویری سنووری هیوا میدیا پێشکەش کرا. ڕێوڕەسمەکە کاتژمێر ۷/۳۰ی دوانیوەڕۆ کۆتایی پێهات. جێی ئاماژەیە بودجەی خولی فێرکاریی ئەدەبیاتی منداڵان لە لایەن موعاوینی وەزیری فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی دابین کرا بوو.

ئامادەکردنی: ڕزگار نووری

## گرینگی فێر بوونی خوێندن و نووسین و ئەدەبی کوردی لە فێرگەدا

فێربوونی زمانی کوردی وەک هەموو زمانێکی دیکە پێویستی بە فێرکاریی(اموزش) هەیە. بە داخەوە زۆربەی خەڵکەکەمان تەنانەت زۆرێک لە نووسەران و شاعیرانیشمان لە نووسینی زمانی زگماکیدا شارەزا نین و لەم بارەوە کەم‌وکووڕی و گرفتیان‌هەیە و بۆ فێربوونی دروستی ڕێنووس و ڕێزمان و ڕستەسازی و هاوتاسازی (معادل یابی) پێویستیان بە خول (دەورە) هەیە. کۆڕی فێرکاری و فەرهەنگیی ئەدەب و بەشە فێرکاریەکەی (فێرگەی زمانی کوردی و ئەدەبیاتی منداڵانی ئەدەب) ماوەی چەند ساڵێکە لە شاری بۆکان و گوندەکان و شارەکانی دەوروبەر و زانکۆکان لەم بارەوە بە دانان و سازدانی خولەکانی جۆراوجۆری فێرکاریی، ڕێنووس، زمان، ئەدەب هەنگاوی زۆر گرینگی بۆ ئەم کارە هەڵێناوەتەوە.

دەبێ ئەوە بزانین ئەو شتەی کە لە فێرگەدا بە ماوەی کورت فێری دەبن؛ ئەگەر بۆخۆتان بە بێ‌چوون بۆ فێرگە بۆ فێربوونی ڕێنووس و زمانەوانی و ئەدەبی کوردی ئەم کارە بکەن ماوەیەکی زۆری دەوێ و تازە قەت ئاوا بە دروستی و ڕێکوپێکی فێری نابن. من بۆخۆم کە ماوەی چەندین ساڵە لەو ناوەندە فێرکاری و کولتوورییە هاوکاریم هەیە بە کردەوە ئەو شتەم هەست کردووە و بۆدەرکەوتووە کە زۆرێک لەم کەسانەی شتیان بۆ نووسین و تایپ بۆ ئەو ناوەندە هێناوە هەڵەی زۆری ڕێنووسی و ئیملاییان هەبووە. دیارە ئەی وایان تێدابووە شیعر و چیرۆک و توێژینەوە و نووسراوەکەی زۆر بە پێز بووە بەڵام بە هۆی ئەوەی فێرکاری و دەورەی نەدیوە لە ڕێنووسدا ئیشکالی هەبووە.

بۆ ئاگاداریی زیاتری فێرخوازان و هۆگرانی زمان و ئەدەبی کوردی پێویستە ڕابگەیێنم فێرگەی زمانی کوردی و ئەدەبی منداڵانی ئەدەب ڕۆژ بە ڕۆژ هەوڵی داوە وانە و مەنهەجەکانی فێرکاریی خۆی تەواوتر و چڕوپڕتر بکا و هەر ئێستا ئەم چەند خولە (دەورەیە)ی هەیە:

١ـ خولی فێربوونی ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی (ئارامی)
٢- خولی فێربوونی ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی لاتین
٣- خولی زمانی کوردی کە بریتیە: لە وانەکانی ڕێزمان، زمانەوانی(فۆنۆتیک، فۆنۆلۆژی، مۆرفۆلۆژی، سیمانتیک، سینتاکس)، وەرگێڕان(تەرجەمە)
٤ـ خولی ئەدەب (ئەدەبیات)ی کوردی بریتی لە وانەکانی: پەخشان(نثر)- شیعر(نظم) — ڕەخنەی ئەدەبی.
٥- خولی مامۆستایەتی بۆ وتنەوەی وانە(دەرس)ی کوردی.

هیوادارم هەموو کوردێک بە تایبەت هەموو هۆگرانی زمان و ئەدەبی کوردی و ئەو کەسانەی کە تازە دەستیان بە نووسینی شیعر، چیرۆک و وەرگێڕان کردووە و دەورەیان نەدیوە لەم خولانەدا بەشداری بکەن هەتا بە شێوەیەکی دروست و زانستی بەرهەمەکانیان بنووسنەوە.

